# نووسەری کورد

گۆڤاری یەکێتی
ئەدیب و
نووسەرانی کوردە

ژمارە ٥ ئەیلولی ١٩٨٦



هیچ بەرهەمێك نادرێتەوە بەخاوەنەکەی ، بڵاوببێتەوە یان نا .

نووسەران خۆیان بەرپرسیارن لە گشت شتێکی نووسینەکانیان

# چەند ڕیشەیەك لە ڕیشاڵی زمانەکەمان

مسعود محمد

کوردێکی هەست بەئازاری هەڵکەوتی کوردەواری بەچەنگ مێژووی بێ ڕەحمەوە بکات خۆی بەو ساوایە شیرە خۆرە دێتە بەرچاو کە لە سینگی دایکی دوور خرابێتەوە : لە سۆزو بزێو بێ بەش دەبێت .

لەو ڕۆژەوە کۆرشی هەخامەنشی بوو بە میراتگری خاڵوانە مادەکانی ، دەمی بە مەمکی مێژووی کوردەوە ناو لە جیاتی کورد هەرچی میراتێکی هەیبوو ، لە مایەکیو واتایەکی ، هەڵی شت بۆ ناو هەناوی حکومەت لەدوا حکومەتی هەخامەنشیو ئەشکانیو ساسانی ... هەتا ڕۆژانی سەردەم کە کورد لە تەك فارسدا وەکوو منداڵی فڕێ دراوی کەس بە خۆیەوە نەگرتووی لێ‌هاتو بوو بەمێوانی ماڵی خۆی .

ئەو بنچکەی بەر لە دوو هەزارو پێنج سەدو ئەوەندە ساڵە کۆرش لەدەستمانی دەرهێنا جارێکی دیکە پەنجەمان لێی گیرنەبۆوە : مێژوومان بوو بەماڵی بێگانـە ، تەپـڵی تۆپـانی پێ‌دەکات .. دای دەلەنگێنێ .. لێی دەقـرتێنێ .. بـۆیـاغی دەگـۆڕی .. بـەسـەریـەوە دەنێ .. بـەئـارەزۆ دەینەخشێنی .. کە پێویست بوو لە قوڕی هەڵدەکێشێ .

بەڕەی ژێر پێمان کە خاکی نیشتمان بێ ، بـە کێشە کێش ، لەبن پێمانی دەر دەهێنێو دەیخاتەوە سەر بەڕەی خۆی . ناوی لووتە شاخو

بیشه‌لان‌و پۆشه‌لان‌و قه‌میشه‌لان‌و که‌نده‌لانه‌کانمان لێ‌ده‌گۆڕێ بایی ئه‌وه‌ی لێمانی نه‌ناس بکات .. فه‌ره‌نجی له‌به‌ر ئاوایه‌کانمان داده‌ماڵێت‌و زۆڵه پۆشاکه‌که‌ی خۆیان تێ‌ده‌ئاڵێنێ .. ته‌زکه‌ره نفوسی خۆی بۆ نـژادی کورد ده‌رده‌کات .

له‌لایه‌ن زمانه‌وه دووچاری ده‌سدرێژییه‌کی وێرانکه‌ر بووین :

کورپه‌ی نـاو بێشکه هـه‌میشه گـوێ ده‌گرێ بـۆ لایلایـه‌ی دایکه دڵسـۆزه‌که‌ی .. ئێمـه به تێ‌چـوونی ده‌وڵه‌تی ( ماد )مـان دابڕاین له‌و لایلایه‌ی که ده‌بوو مێژوو له گاثاکانی ئاڤێستاوه تا ئه‌به‌د هه‌ڵبه‌ست‌و به‌یت‌و گۆرانی‌و به‌سته‌و لاووکمان بۆ بچڕێت . ئاڤێستاو هه‌رچی لێی که‌وته‌وه له ئێمه تار بوو ، باوه‌شێکی بێگانه مێزی لێ‌گرت‌و به‌به‌ر مه‌مکییه‌وه نیشت . پتر له دووهه‌زارو پێنج‌سه‌د ساڵه مژمان له‌گۆی مـه‌مکی دایکه ئـاڤێستا نه‌مشتووه ..

خـه‌تی ڕه‌چه‌ڵه‌کی ئـاڤێستا خـوار بـۆوه بـۆ خـاوه‌ن ده‌سـه‌لاتی ده‌وڵه‌تی : هه‌رچه‌ند زاناکانی زمان ده‌ڵێن فارسی کۆن جودایه له زمـانی ئـاڤێستا ، بـه‌لام جوداش بێت هـه‌رچی ئـاڤێستـاو داب‌و ده‌ستـووری زه‌رده‌شتی‌و پێوه‌ندی ( بیهـ دین ) به ده‌وڵه‌ته‌وه به هه‌موو ئه‌و سامانـه ئـه‌ده‌بی‌و دینی‌و کۆمـه‌لایه‌تی‌و سیـاسییه‌ی له‌مـاوه‌ی ڕۆژگاری نێـوان تێ‌چوونی مادو تێ‌چوونی ساسانییان زاوزێی کردبێ بوو به‌هی فارس . ئه‌و ڕۆژه‌ی سپای ئیسلام ڕه‌وی هێنا بۆسه‌ر ئیمپراتـۆریه‌تی ســاسانیـه‌کان کوردی چاره‌ڕه‌ش بریتی بوو له ڕه‌عیه‌یه‌کی ڕه‌ش‌و ڕووت که‌هیچ پشکی نه‌بوو له شیرنایی حوکم : هه‌زارو سه‌د ساڵ پتر بوو کورد له پله‌ی هه‌ره به‌ره‌ژێری بێ‌ده‌سه‌لاتی‌دا سوخره‌و بێگاری بۆ داگیرکه‌ر ده‌کرد . چه‌ند نیمچه کوێخایه‌کی په‌ڕپووتی فه‌رتووتی کورد وه‌کوو ڕێوی چاوه‌ش کلکـه کوته‌ی بۆ شاهه‌نشاو مه‌لیك‌و ئه‌سته‌ندارو سپه‌هـ بودو مووبه‌دو هیربه‌د و

دەست ڕۆیشتووەکانی دیکەی دین و دەوڵەت دەکردو نیمچە مەرحەبایەکی لالووتانەی لێ وەردەگرتنەوەو بەحاڵ نانێکی حەرامی پێ لەهەژاری کورد دەڕووتاندەوە . هەر چونکە کورد بەهیچ جۆرێك لە دینی زەردەشتیی دەوری ساسانییان کە بەلای چاکەی دەوڵەتدا خوار کرابۆوە هیچ سوودێکی نەدەدیت ، بگرە لە زەرەرو ئازار بەولاوە لێیەوە بۆی نەدەهات ، بایی خۆ خوراندنیش بەرگری بۆ ئەو دین و دەوڵەتە نەکردو بەگژ عەرەبدا نەهاتەوە :

لە ماوەیەکی زێدە کورتدا کورد نژاد دینی تازەی کرد بە جێگری دینی کۆنی ، مەگەر لێرەو لەوێ خاوەن دەسەلات و قەلاتێك کە بەرژەوەندی لەگەڵ دەوڵەت و دەستگای دینی گونجا بێ نەختێکی خۆگری کردبێ ئەویش هەر بایی ئەوەی کە بەفری سبەینان هەتاوی نیوەڕۆی پێ بکەوێت و بتوێتەوە . هەرچی فارسەکە بوو چونکە خاوەن دەوڵەت و دەسەلات بوو حەشاماتێکی زۆری تێدا بوو پەرۆشی دینەکەو دەوڵەتەکەی بێت و بەدڵ پارێزگاری لێ بکات چونکە پارێزگاری لە بەرژەوەندی خۆی دەکرد ، هی وەهاشیان تێدا بوو بەدڵ پێڕەوی لە دینی زەردەشت دەکرد تا ئەوەی بەشێکیان پەنایان بۆ چین برد ، پێشتریش یەزدگورد خۆی داوای یارمەتی لە ئیمپراتۆر تای تسونگ Tai Tosung کرد بەلام لێی نەبیست . دوای کوژرانی یەزدگورد پەنابەران دەستە دەستە بۆ چین دەچوون هەتا کۆمەڵێکیش لەگەڵ ( پیرۆز ) کوڕی یەزدگورددا خۆیان گەیاندە تەخارستان کە ئەوسا لەبەردەستی چین بوو . لە ٦٦٢ ی ز ئەم پیرۆزە لە لایەن شای چینیەکانەوە بەشای ئێران وەرگیرا . دوای ئەو کوڕەکەی ( نرسی ـ نەرسی ) بوو بەجێگری باوکی و خواییشتدا شای چین لەشکری بۆ ڕێك خست کە وولاتی خۆی پێ داگیر بکاتەوە بەلام لەگەڵ سەردارە چینییە هاوڕێکەی لێیان بوو بە ناکۆکی و سپاکە بەرەو چین ، لە ٧٠٧ ز ، گوەڕایەوە . لە ٧٥٠ ز . دوایین کمەڵەی فارسەکان کە پەنایان بۆ چین

بـردبیٚ له سجلاتی چـین ناویـان بردراوه . یـه‌زدگورد لای چینییـه‌کان Yessesse ، پیرۆز pilusse ، نه‌رسی ni - nisse ناو هێنراوون .

کۆمه‌ڵێکی دیکه له خوراسانه‌وه بۆ لای جه‌زیره‌ی هورمزو که‌نداوی عه‌ره‌ب جمین‌و به‌ینێك له‌و ناوه مانه‌وه به‌ڵام له‌شکری ئیسلام بۆیان چوو . سـه‌ره‌نجام پـه‌نایـان برد بـۆ وڵاتی گوجـراتی هیندوستـان‌و له شـاری ( سه‌نجان ) ڕاجا ( جادی رانه ) په‌نای دان‌و مانه‌وه . دوای سێ سه‌د ساڵ به زۆر شوێنی دیکه‌ی هیند دا بڵاوبوونه‌وه تا له ئه‌نجامدا شـاری بۆمبای بوو به بنگه‌ی هێزو سه‌قافه‌تی پارسه‌کانی هیند .. [ به کورتی له لاپه‌ڕه ١٧ ـ ٢٢ ، مزدیسناو ادب پارسی ، انتشارات دانشگاه تهران ـ د. محمد معین ] .

یه‌کێك له ئاکامی به‌سترانه‌وه‌ی به‌رژه‌وه‌ندی فارسه‌کانی سه‌رده‌می فه‌تحی ئیسلام به ده‌وڵه‌تی ساسـانی ئه‌وه بـوو که دوای داگـیر کردنی ( مداین ـ پایته‌ختی ساسانی ) له‌خوار به‌غدا ، هه‌رچی فارس‌و زمـانی فارسی بوو له‌گه‌ڵ فه‌رمانڕه‌وایی یه‌زدگورد دا پێچرایه‌وه‌و ئاوه‌ژووی دیوی ئێران بۆوه . کورده‌که چونکه پشکی له هیچ شتێکدا نه‌بوو که‌س به‌لای‌دا نـه‌چوو ، هـه‌ر له‌شوێنی خـۆی مایـه‌وه ، بـه‌ڵکـوو ئه‌و بـه‌تاڵاییـه‌ی که به‌کشانـه‌وه‌ی فارسـه‌کان له دیـوی عیراق پـه‌یدا بـوو کوردی تێ ڕژاو سنووری کوردنشین به‌ره‌و باشوور خۆی لێك کێشـایه‌وه . بـه‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا فارس هه‌ر مایه‌وه به میراتگری سـه‌قافـه‌تی هه‌زارو ئـه‌وه‌نده سـاڵه‌ی ئێران ، زۆریشی نـه‌بـرد دوای له‌ده‌ست چـوونی حـوکمیـان ، سه‌رله‌نوێ ، زمان‌و ئه‌ده‌بیـاتیان بـره‌وی ستانـده‌وه ، ته‌نـانه‌ت کتێبی باس‌کراو له ژێـر خاڵه‌کـانی : نهضتهای سیـاسی ، نهضتهای مـذهبی ، پیدایش فرق متنفذ ، کوششهای علمی‌و ادبی ایرانیان . به‌رته‌ك دانه‌وه‌ی فارسه‌کان له پاڵه‌په‌ستۆی عه‌ره‌ب‌و ئیسلام باس ده‌کات تا ده‌گاتـه یادی

( زبان شیرین پارسی ) که به پەیدابوونی بویژانی وەکوو : محمد بن وصیف سگزی ، حنظلة بادغیسی ، ابو شکور بلخی ، شهید بلخی ، رودکی ، دقیقی و فردوسی و پەخشان نووسی وەکوو بلعمی ، وەرگێرەکانی تفسیر طبری ، دانەری حدود العالم ، نووسەری الابنیة عن حقائق الادویة ، دانەری مێژووی سیستان و دانەرانی شاهنامە ابو منصوری و ( بهمت فرهنگ نویسانی مانند اسدی و فرخی و قطران تبریزی ) ئا بەهۆی ئەمانەوە [ هی دیکەش ]زمانی فارسی لەسەر بناخەیەکی مەحکەم دامەزرا ( لاپەرە ٢٨ ، ٢٩ کتێبی ناوبراو ) . لەمەوە سەر لەنوێ فارس بووە بە میراتگری هەموو سەقافەتی کەرتی ئێرانی لە گەلەکانی هیندی ئێرانی . بە هۆی هەبوونی نووسینی ئەدەبییەوە لە کۆنی کۆنەوە فارسی خۆی پاراست لەوەی وەکوو کوردی ، کە نووسینی نەبوو ، ببێ بە دایالێکتی جۆراجۆری تێك نەگەییشتوو ئێستا ، کە دێم ووشەیەکی کوردی ئەمڕۆکەمان ڕادەگرم لە بەرانبەر ئاوێنەی مێژووی زمانی ئاڤێستا [ گاتاکان بەتایبەتی ]و ( ڤیدا )ی سانسکریتی ، ماوەی سێ هەزار ساڵێکی لێك ترازان و نائاشنابوون دەکەوێتە نێوانەوە کە ووشەکە تێیدا بە بڕیاری واقیع خشکەی بەملاو بەولادا کردووەو گۆڕاوەو قرتاوەو سوواوە .. زۆر ووشەی کە خشکەی لەگەڵ کورددا نەکرد بۆ پەناو پەسێوان بە یەکجارەکی لێمان دابڕاو نەناس بوو . هەرچی زاراوەو کەرستەی پەرستنی زەردەشتی هەیە ، مەگەر چۆنها ، لە فەرهەنگی کوردی سڕایەوە چونکە هەروەك بە گۆڕانی دین لە زەردەشتتیەوە بۆ ئیسلام ئەو زاراوانە بەلاوە نران نووسینیشمان نەبوو بتوانێ لە ناو کفنی دەفتەران زیندە بەچاڵ یاخود مردە بەچاڵیان بکات و لە ڕۆژی پێویستدا گۆڕ بەدەریان بکاتەوە .

لەم ڕۆژگارەدا زەردەشتی فارس هەن لە یەزدو کرمانی کرمانی ئێران و لە بۆمبای و هەندێ شوێنی دیکەی هیند بەشێوەیەکی وەکوو

شێوەی سەردەمی ساسانی نوێژو مەراسیمو دوعا خوێنی‌ی ئایینی دەکەن . دیارە ئێمەی کورد دینی ئیسلام بەو دینە ناگۆڕینەوە بەلام لەلایەن سەقافەتی میللییەوە چەندین سەدان ووشە هەیە لەو مەراسیمەدا بەزانینیان سامانی مەعنەویمان دەوڵەمەند دەبوو چونکە ووشەکان دەچنەوە بۆ بەرایی نزیکی سێ هەزار ساڵ ، ئنجا چ هێزێك لەبەر ووزەی زمانەکەمان دەگەڕا کە ڕیشەی بچێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ لەمەو بەر ؟ ڤیدای سانسکریتی‌و ئاڤیستای زەردەشتی کۆنترین دوو سەرچاوەی فەرهەنگ‌و ڕۆشنبیری سەرلەبەری گەلە هیندی ـ ئاوروپاییەکانن کە هیندەی دوو خوشکی جمرانەش لە یەکدی نزیکن : هەر ووشەیەکی کوردی سەردەم لەوانە بێ وێنەی قالبی ئاڤیستایی پێوە مابێ پتر ڕەسەن بوونی کوردی بەئیسپات دەگەیەنێ لە دەیان ووشەی ئەوتۆی فارسی سەردەم چونکە مانی ووشەی ئاڤێستا لە کوردی‌دا ئەوە ڕادەگەیەنێ [ یان هەر نەبێ بەلای ئەو باوەڕەمانەوە دەبات ] کە یەك بوونی زمانی ئاڤێستاو زمانی کوردی لە بنەڕەتدا هۆی مانەوەی ووشەی ئاڤێستایە لە کوردی‌دا نەك پارێزرانی ووشەکە بە نووسین چونکە کوردی خاوەن نووسین نەبووە . فارس لە نووسیندا هەزاران ووشەی عەرەبیشی وەها پاراستووە کە ئەگەر عەرەب فەرامۆشیشی کردبانایە هەر نەدەمردن ، ووشەی ئاڤێستاش هەمان حیسابی بۆ دەکرێ کە لە دەفتەری نووسراوی فارسی‌دا وەکوو ووشەی عەرەبی ماوەتەوە . دەمەوێ بڵێم کە دیترا ووشەیەکی ئاڤێستا لە فارسی‌دا دەردەکەوێتەوەو لە کوردی دا بزرە ، ئەم دەرکەوتنە هی بوونی نووسینە بزربوونەکەش هی نەبوونی نووسینە نەك گۆیا خاوەنایەتی فارسی بە ئیسپات دەگەیەنێ .

بەکارهێنانی ووشە لە نووسینی ئەدەبی‌دا پتری بەزمانی خۆی دەبەستێتەوە لەوەی ئاخاوتنی بێ نووسین پێیەوە ببەستێتەوە ، ئەویش

نەك هەر بەهۆی پاراستنی ووشەی نووسراو لە فۆتان بەڵكوو لە بەر هۆیەكی زێدە گرنگی سەر بە سروشتی زمانی ئەدەبییەوە : ئاخاوتن لەوانەیە ووشە لەیەك قاڵبدا بەكار بهێنێ بەتایبەتی ووشەی وەرگیراو كە هەر پێوەی دییار دەبێ بێگانەیە ، كەچی بەكار هێنانی ئەدەبی جۆرە قاڵب لە ووشە دادەڕێژێ وەك كە دێت گەردانی دەكات وەیا پێشگرو پاشگری پێوە بلكێنێ وەیا بە ووشەی دیكەیەوە ببەستێتەوە كە ئیتر ڕەنگە ئەوەندە لە قاڵبی بنەڕەتی خۆی دوور بكەوێتەوە كەنەناسرێتەوە . بەم جۆرە چەندین ووشە لە تاكە ووشە دەكەوێتەوە هەمووشی مۆركی ئەو بنەڕەتەی پێوە دەبێت ، بەمەشدا هەروەك باشتر دەبێتە ماڵی زمان ، لەچەنگ فۆتانیش یەكجارەكی ڕزگار دەبێ چونكە لەوانەیە قاڵبێك و دوو قاڵبی هەر بەردەوام و بەرحەبات بێت ، هەرچی تاكە ووشەیە یەك ژین و یەك مردنی هەیە . بە نموونە ووشەی ( vanghu )ی ئاڤێستا بە واتای چاك ، باش هاتووە . ئەم ووشەیە سەرەژێر بۆوە هەتا لە فۆرمی ( بە ـ بیهـ ) گەییشتە فارسی . لەكوردیدا وێنەی سەربەخۆی ووشەكە تێ چووەو تەنها لە ( بێ شەما )دا بە واتای تووتنی بۆن خۆش وێنەی ماوەتەوە . كوردەكە كەمتاكورتێكی نەبێ نازانێ بۆچی ( بێ شەما ) وەكوو ( بێپارە ، بێحەیا ) واتای كەمایەتی ناداتەوە بەپێچەوانەوە پەسەندایەتی لێ دەفامرێتەوە . لە فارسیدا چەندین قاڵبی لێ پەیدا بووە هێندێكی سەر بە ئاڤێستاوە دەنێن لەمانە ووشەی ( بهشت ـ بەهیشت ) . ئەم ووشەیە لە vanghu هاتووە كە خراوەتە سەر سیفەتی باڵا ( super lative )و بۆتە vahishta ، كە بەواتای چاكترین ، باشترین دێت . لە ڤەهیشتەدا كە بۆتە ( بەهیشت ) ووشەی ( بیهـ )ی فارسی ئاشكرایە . كورد دەڵێ بەهەشت ووشەی ( بیهـ و vanghu )ی دۆڕاندووەو نازانێ ووشەكە لە چییەوە هاتووە ، بەمەشدا بۆتە میوان نەك خاوەن ماڵ . ئەگەر فارس خاوەن دینی زەردەشت و ئاتەشكەدەو هیربەدو moobەدو مەراسیمی

زەردەشتی و دەقەکانی ئاڤێستاو پەهلەوی نەبوایە ئەو پێوەندییە نزیکەی بە بەهەشتەوە نەدەبوو کە دەماری خزمایەتی ( بەهیشت و ڤەهیشتە ) وەها بە دروستی بهێڵێتەوە . دەبێ بشڵێم ڤەهیشتە بە دوا ووشەی ( acha ، ئەشە )ی ئاڤێستادا هاتووە وەکوو صیفەت و موصوف [ ئەشە = راستی و دروستی ] . بەو پێیە : ( ئەشەڤەهیشتە = باشترین دروستی ) . ئەشە فەرامۆش کراوەو ڤەهیشتەی وصف ماوەتەوە [ ل ، ٥٥ فرهنگ ایران باستان ، پخش نخست ، پور داود ] .

زۆر بە سەیری ، گاڵتەی مێژوو ئەم ووشەیەی ( بیهـ )ی لە کوردیدا بە جۆرێکی وەها پەنامەکی و تەماوی بەدەر داوەتەوە سەرنجی وورد نەبێ نایدۆزێتەوە ، کە بە دەریشی دەداتەوە حیکایەتێکی سەیر لەگەڵ خۆی دا دەهێنێ : دین لە ئاڤێستادا ( daena دەئینا ) بووە [ ل، ٣ سەرچاوەی پێشوو ] دوواتر گۆڕاوە بە دین . ئەوانەی پێڕەوی زەردەشتیان کردووە پێیان گوتراوە ( بیهـ دینان ـ خاوەنانی دینی چاك ) . لەمەوە دەردەکەوێ ناوی کۆکی ( بادینان ) کە هەم بە زێی گەورەو هەم بە سەرلەبەری هەرێمی لای ڕاستی ئەو زێیە دەگوترێ هەر خۆیەتی لە کۆندا( بیهـ دینان ) بووەو چ پێوەندیی بە ( بهاء الدینان )ەوە نییە . بەڕواڵەت عەجاییب لەوە دایە [ کە لەڕاستیدا عەجاییب ڕەوینەوە لەوە دایە ] کە هەر لە هەرێمی ( بادینان ـ بیهـ دینان )دا یەزیدی ( ئێزدی ) بە جیرانەتی بیهـ دینان دەژین . بۆ دەبێ وابێ ؟ لە نووسینێکی مامۆستا توفیق وەهبیدا هاتووە : یەزیدیەکان ( میثرایی )ن واتە ئەوان لەسەر دینی ( دووهێز پەرستی ) مانەوەو نەبوون بە زەردەشتی [ مامۆستا وەهبی نامێلکەکەی بە ئینگلیزی داناوە ] . ئنجا سەیر نییە لەوەدا کە شوێنێکی میثرایی وەیا دژی دینی زەردەشتی تێدا بێ بەحوکمی مەنتیق

( بیهـ دینان ) هەمیشە یاد بکرێتەوە تێیدا . [ دوای نەختێك پتر ڕوون دەبێتەوە ] هەرێمەکانی دیکەی کوردەواری کە بوون بە مسڵمان پێوستیان نەما بە ( بیهـ دینان ) چونکە ناشێ مسڵمانیش بن‌و وولاتەکەش هەر بەهی دینی زەردەشت لەقەڵەم بدەن . لە زاراوە دینییەکانی یەزیدیدا ووشەی ( کریف )ماوە بە واتای برای ئەبەدی . ئەم ووشەیە لە سەردەمی زەردەشت‌و ئاڤێستادا ( کرفە )ی هەبوە بە واتای ( پاداش ـ ثواب ) کە دەکاتەوە پاداشی ئەبەدی چونکە هی دوای مردنە [ ل ، ۹۷ ، ۹۸ ، فرهنگ ایران باستان ] . هەڵبەت ئاڤێستا لە خۆیەوە کرفەو کریفی نەخولقاند ، دیارە لە کۆنترەوە ماوەتەوە ئیتر چ جۆرە پاداشی تێدا مەبەست بووبێ با بووبێ . زۆر ووشەی کۆن بەواتای نوێ هاتنە ناو زەردەشتییەوە یەکێك لەوانی هەرە گرنگ ووشەی ( دێو )ە .

ئەم ووشەیە لە ئاڤێستادا ( daeva دەئیڤە ) بووە [ ل ، ۳ فرهنگ ایران باستان ، ل ، ۲٤٤ مزده یسناو ادب پارسی ] . دێو لەکۆندا ، بەر لە زەردەشت ، بەچەندین پەروەردگاری ئاریایی گوتراوەو پەرستراوە . بەلام دوای هاتنی زەردەشت‌و ناساندنی ئەهورەمەزدا هەموو خواکانی کۆن ، واتە هەموو دێوەکان ، کران بە گومڕاکەرو شەیتان [ ل ، ۲٤٥ ، مزدەیسنا ..... ] . ئەوانەی لەسەر دینی کۆن مانەوەو لە دێوپەرستی بەردەوام بوون لە زەردەشتیدا پێیان گوترا ( دیو یسنان ـ دێو یەسنان ) تا ئەوەی ( kavi ـ وێنەی کۆنی « کەی » ) داندرا بە ( شهریار دیویسنان )و ( Karpan ) بە ( پێشەوای دیویسنان ) لەقەڵەم درا [ ل ، ۲٥١ فرهنگ ایران باستانی ناوبراو ، پەراوێز ٦٦ ] . کە ڕەپ خۆی لە ئاڤێستادا بەو کەسانە گوتراوە کە خۆیان لەدینی تازەی زەردەشت کەڕ کرد . کەڕەپ‌و کەڕ یەك شتن . ووشەی ( یەسنە )و ( یەزەتە )ی ئاڤێستاو ( یەجەتە )ی سانسکریتی لە ڕیشەی ( yaz ، یەز ) بە واتای ( پەرستن )

وەرگیراوون [ ل ، ٢٣٩ مزدیسنا ... ] . لەمەوە بەتەواوی ئاشکرا دەبێ کە ( داسنی ) بریتییە لە ( دێویەسنا ) بە واتای ( دێـو پەرست ) ئـەم دێوەی ناو ووشەی ( داسنی ) کە نەختێکی لێ سوواوە ، بە وەرگێڕانی واتاکەی لە ( خودا )وە بۆ ( ئەهریمەن ) بوو بە ناحەزی ئەهوورەمەزدای دینی زەردەشت ، واتە ( بیهـ دین ) . ئنجا سەرلە نوێ تێ دەگەین بۆچی ( داسنی ) تەنها لە هەرێمی ( بیهـ دینان ) بەردەوام بووە یاخود بۆچی ( بیهـ دینان ) هەر لە هەرێمی داسنیان خۆی پاراستووە :

| | | |
|---|---|---|
| بیهـ دین | بیهـ دینان | ( ان ) هی کۆکردنە |
| دێویەسنا | دێویەسنان | ( ان ) هی کۆکردنە |

ووشەی ( دێو ) لای هەموو گەلە هیندی ـ ئەوروپاییەکان ، بە لێدەر هاویشتنی ئێرانیە زەردەشتیەکان ، واتای بنەڕەتی خۆی کە ( خوا )یـە پاراستووە : لای هیند deva . لای یۆنان zeus . بە لاتینی deus . بـە فرەنسەیی dieu .

ووشەی یەسنا . هەر خۆیەتی دوواتر لە فارسی دا بۆتە جشن و لە کوردی‌دا بۆتە جەژن .

لەم روون کردنەوەیەدا کە هەمووی ئەوروپاییەکان کردوویانە . ئێمە لە حاڵ و باری خۆمان دەگەین کە داسنی ئەوخوا پەرستانەن لە پێش هاتنی زەردەشت لە قالبی ( دێو ) وەکوو گەلەکانی دیکە پەروەردگاریان دەناسی ، هەڵبەت بەلای خۆیانەوە ( دێو ) هەر لەو واتـایەدا مـایەوە هـەرچەنـد لەماوەی چەندین هەزار ساڵدا گەلێك لە باوەڕە کۆنەکانیان لە بیـرکران و گەلێك شێوە باوەڕی تازە هاتە ناو دینە کەیانەوە .

دەمێنێتەوە وەلامی پرسیـارێك لە خـۆمانی بکـەین : بۆچی کـورد بەتێکڕایی دووجاران دینی خۆی گۆڕی ، جارێکیان کە زەردەشت مەزدە یەسنایی داهێنا ، جارێکشیان کە عەرەب ئیسلامـەتی بۆ هێنـا ، کەچی

ئێزدییەکان ( داسنیەکان ) لە هەردوو جاردا پەنجەیان لە دینی خۆیان گیرکرد ؟

ڕاستییەکەی من ناتوانم بەڕەهایی و بەرمەیدان مل لێنێم . دەزانم جوولەکەش پتر لە غەیری خۆیان ئەو ڕژدییەیان پێوە دیارە ، تا ڕادەیەکیش بە خۆوەگلانی جوولەکە لە تەعلیماتی تەورات و تەلموود دەفامرێتەوە چونکە لە ڕادەبەدەر هانیان دەدا بۆ خۆ بە گرنگ زانین [ بەلای خۆیانەوە ئەوانن میراتگری ئادەم و نووح ] بەلام لە دینی ئێزدییاتی ئەوەندە نازانم پەنای ببەمە بەرێ بۆ کردنەوەی ئەم گرێیە . ناوی ( ئێزدی ) خۆی هەنێکمان بەڕێگاوە دەبات لە ڕووی ئەوەوە کە ناوی ( ئێزد ، یەزد ، یەزدان ) لای دینی زەردەشتیش ڕێز لێ گیراوە : هەرچی ( دێو )و دێویەسنەیە یەکجارەکی مۆرکی ناحەزایەتی لێ درا لەلایەن زەردەشتەوە کە ئیتر ڕێ نەما کەس بەخۆی بلێ دێوپەرست بەلام ( ئێزدی ) حیسابی جودایە :

Yaz بەواتای پەرستن ( یەزەتە )ی لێ وەرگیرا بە واتای ( لایقی پەرستن ) ئەم یەزەتەیە ( یەزد ـ یەزدان کۆیەتی )ی پەهلەوی و ( أیزد )ی فارسی لێ کەوتەوە . یەزەتە ، دواتریش یەزد ، بەفرشتەی چاکە ڕۆییشت . [ ل ، ٢٤٠ مزده یسناو ادب پارسی باس کراو ] . ئەو هێزانەی لە زەردەشتیدا یەزەتەیان پێ گوتراو لە پەهلەوی بوون بە یەزد ، لە کۆندا بەلای ئارياييەکانیش پەسەند بوون . لەبەر ئەمە زۆر بەئاسانی و بەنیازی خۆ پارێزی دێویەسنەکان ناوە شیرنەکەی ( یەزد )یان بە خۆوە گرت کە ڕقی زەردەشتییانی لێ دوور دەخستنەوەو خەلەلێکیشی بە پاوەڕیان نەدەگەیاند . ناوی ( داسنی ) لەلایەن ناحەزەکانیانەوە پێیان دەگوترا .

لەلایەن گۆکردنەوە هەروەك فارسەکان ( یەزد )یان کرد بە ( أیزد ) داسنیەکانیش کردیان بە ( ئێزد )و ( ی ) نیسبەتیشیان بە پێی ڕێزمانی

کوردی پێوه نا و ووشه‌که بوو به ( ئێزدی ) . ده‌بێ له کۆندا (ئێزدیك ) بووبێ چونکه له‌په‌هله‌وی‌و به‌ره‌ژوورتر ئه‌داتی نیسبه‌ت ( یـك ) بووه ، دواتر کافه‌که‌ی سواوه چ له‌فارسی بێت‌و چ له‌کوردی .

ئه‌م لێك دانه‌وه‌یه جۆره مه‌سڵه‌تیه‌کی خۆپاراستنی دێویه‌سنه‌کانی تێ خوێندۆته‌وه که حه‌ق‌و پێویستیش بوو ، به‌ڵام بایی ته‌فسیری ته‌واوی هه‌ڵوه‌ستیان ناکات . ئێمه نازانین له‌ده‌می په‌یدا بوونی زه‌رده‌شتی‌و دوای بڵاو بوونه‌وه‌ی به‌ئێران زه‌میندا چه‌ند تاقم مانه‌وه به ( karap ـ که‌ڕه‌پ ـ که‌ڕ ) که نه‌هاتنه سه‌ر دینی زه‌رده‌شت ، به‌ڵام به پێی ڕاگه‌یاندنی مێژوو به‌درێژایی سه‌دان ساڵ تاقانـه دینی ئیمپراتـۆریه‌تی ئێـران زه‌رده‌شتی بووه . له لاپه‌ڕه ۱۱۱ ، مزده یسناو ادب پارسی هاتووه که قاتلی[1] زه‌رده‌شت به‌خۆی‌و پێنج برایه‌وه ناویان له نووسراوه‌کانی ( بندهشن ، زات سپرم ) براوه‌و له خانه‌واده‌ی ( که‌ڕه‌پ ) بوون . قاتلێ زه‌رده‌شت توورانی بـوو نه‌ك‌ئێرانی ، هه‌ڵبه‌ت دواتر که ناوی بێت ده‌بێ له ( که‌ڕه‌پ )ه‌کان حیساب بکرێ . بۆیه‌یه مانه‌وه‌ی دێو په‌رستی‌و له‌و سه‌رده‌مانه‌دا که دینی زه‌رده‌شت فه‌رمانڕه‌وا بوو دیارده‌یه‌کی سه‌یره‌و شایه‌دی بۆ باوه‌ڕ مـه‌حکه‌می ئـه‌و کۆمه‌ڵه ده‌دات . به‌ڵێ ، زه‌رده‌شتی چاو پۆشی له جووله‌که‌و گاووریش کرد به‌ڵام ئه‌مانه بێگانه‌و له نژادی غه‌یری ئاریاو ئێران بوون‌و له‌چاو سه‌رده‌می زه‌رده‌شتدا زۆر به دره‌نگه‌وه که‌وتنـه خاکی ئێـران‌و قه‌ڵه‌مـڕه‌وی دینی زه‌رده‌شتی ، خۆ گاوو ( دییان ) ده‌وری ٦٠٠ ساڵ دوای زه‌رده‌شت بڵاو بۆوه .

به‌هه‌مه‌حاڵ ئێزدییه‌کان نموونـه‌ی هه‌ره کـۆنی دانیشتووانی ئـه‌و ناوچه‌یه‌ن که‌به‌شی ( ئێرانی ) له ( هیندی ـ ئێرانیه‌کان ) تێیدا نیشته‌جێ

---

( ۱ ) ناوی قاتلی زه‌رده‌شت به پێی خویندنه‌وه‌ی له په‌هله‌وی چوار جۆر هاتووه :

Brad-resh, Brat-Royishn, Brat-resh, Bratrok-resh

بوون واته کۆنترین کوردن و له باوەڕدا پێش ئاڤێستا دەکەونەوەو دەبن بە هاوتەمەنی ( veda )ی هیندو لەویش کۆنتر . ئەگەر باوەڕی پێش زەردەشتیان بۆ پاراسترابایە دەشیا بە نموونەی باوەڕی هەموو گەلە هیندی - ئەوروپاییەکان حیساب بکرێت . بەلام داخەکەم نەبوونی نووسین لەماوەی دوو هەزار سالدا ( هەتا کەوتینە دەورانی بابا طاهرو ئەحمەدی خانیو جەزیری .. و ئیدریسی ) پتر لە لمی بیابان کە هەموو شتێك ژێر خاك دەکات ، زمانو مێژوومانی ژێر مەرگ خست چونکە دەشێ چشتی ژێر لم بە لێدانەوە ، ڕۆژەك لەڕۆژان ، دەر بخرێتەوە بەلام ووشەیەکی لە زماندا نەمێنێو نووسینیش نەی پاراستبێ یەکجارەکی دەفوتێ : بۆیەیە سالەهای ساله خەفەتی بێ سوود دەخۆم لە هەژەندی[1] دیاردەی نەبوونی نووسینی کوردیو فەوتانی ووشەو ڕووداوی کوردیو بێ سەروشوون چوونی ناوداری کورد لە مرۆڤو لە خاكو لە ئاوی و لە ئاواییی . لە گۆشەیەکی ناچاریو پەرۆشی بێدەسەلاتانەمەوە تەمەنێکە زەق زەق دەنۆڕمە ئەو دروشمانەی کەوا کز کز بۆڕێ نموونیمان بەرەو رابووردوو دەجریوێنن وەکوو ئەستێرە دوورەکانی کەشکەلانی فەلەك . لەو هەولە قەلەندەرانەمەوە وەکوو سوالکەر ، بەدەم ڕۆژگارەوە ، کە چکە شیوێك لێرەو گوێچکە نانێك لەوێ کەوتنە ناو کەشکۆلی هەژاریمەوە : بایی ئەوەی سەری خوێنەر بە گوتارێك بیەشێنم [ ڕاستتیەکەی پترم لا هەیە بەلام بەلێنێك لێ ناگەڕێ جگە لەچەند وشەیەك بدرکێنم ] ، لەو زەخیرە دەروێشییە گردو کۆییم کردووە چەندێکی پێشم کرابێ خەریك بووم ئەو ووشانە بدۆزمەوە کە لە کوردیدا شێوەی ئاڤێستایی یاخود هەر نەبێ کۆنینەییيان پێوە بێتو لە فارسیدا نموونەیان نەبێت . ناوناوەش ووشەی

---

( ١ ) هەژەند :

ووشەیەکی دارژاوە لە ڕەگی ( هەژ - هەژاندن - هەژان )و لە کێشی ( تەژەند ، ڕەوەند ، زەبەند .. ) بۆ ڕووداوێك ئەوەندە کاریگەر بێ مرۆ بهەژێنی ، وەکوو : هەژەندی کوژرانی غاندی ، هەژەندی تێك چوونی کۆماری مەهاباد .

ئەوتۆم هاتۆتە بەرچاو کەوا هەرچەند لە فارسیشدا نموونەی هەیە بەلاّم دەلالەتی ووشەکە خۆی لە فەرهەنگ و کەلەپووری کوردیدا بایـەخێکی تایبەتی هەیە ، یەکێك لەمانە ووشەی :

## دوغدو :

ئـەم ووشەیـە ناوی دایکی زەردەشتو لە قـەومی مادە . گـەلێك سەرچاوەی باوەڕ پێکراو ئەم ڕاستییە دەڵێن ، یەکێك لەوان کتێبـەکەی ( مزدیسنا ... ) ی باس کراوە . لە لاپەڕە ٩٠ ، ٩١ دا باسی دوغدو دەکات کە دایکی زەردەشتە و لە ئیسپاتی قسەی خۆی ئەم ڕستـەیە لە دەست نەچووەی ( هادختنسك ) ی ئاڤێستا دەهێنێتەوە :

ma azarayoish Zarathushtra ma pourushaspahe ma Dugdovam aethrapaitish.

واتاکەی : مەئازارێنە ، زەردەشت ، نە پوروشەسپو نە دوغدوو نە هیربەدان .

پـوروشەسپ بـاوکی زەردەشتە ، دوغـدو دایکییەتی ، ووشـەی کۆتاییش شکلّی ئاڤێستایی ئەو وەزیفە دینییەیە کە دواتر بوو بە هیربەد . دییارە ( aethrapait ) هیربەدە ، ( ish ) یش وابزانم نیشانەی کۆیە .

گـرنگیی ووشەی دوغـدو لەوەوە دێت کە وەك لەو سـەرچاوەیـە نووسراوە ، دەڵێ : دوغدو هاوڕەگـە لەگەڵ ( دختـرو دخت ) ی فارسیو ی daughter ی ئینگلیزیو ( دتر ) ی لەهجەی گێلەکی . لەمەوە دەردەکەوێت ووشەی دوغدو بەواتای کیژ سەرچاوەی ( دختر ) ە چونکە ئاڤێستا هەزار ساڵێك لە فارسی نوێ کۆنترە . لێرەدا خەفەتی بێ نووسینی دەمار گشت دەکات : تۆوەرە خاوەن ووشە بیت بەلاّم خۆت لێی نیمچە دەست بەتاڵ بیت

و خەڵکی دیکەش تەراتێنەی پێ بکات . ئێمە لە پەراوێزێکی تەسکدا ( دۆت ) بەکار دەهێنین ، ئەویش نەك تێکڕای کورد . هۆز هەیە دەڵێ ( دۆت مام ) بەواتای کیژی مام وەك کە دەشڵێن ( پس مام ) بە واتای کوڕی مام . ئەم ( پس )ە لەگەڵ ( پسر )ی فارسی یەك شتە . ووشەی ( پزدان )یش کە ( مشیمة )یە ئەو ( پس )ەی تێدایە . هەروەها دەڵێین : لە شایی دۆم لەدەستدا بوو . ئەم ( دۆ )یەش ( دۆت )ەو لێی قرتاوە . کەچی فارسی دختر ، دخت ، شاهدخت ، آذر میدختو چەندین ووشەی دیکەی هەن بەوەوە شاد بوون .

دەمەوێ تۆڵەی دوغدو بە ووشەیەکی دیکە بکەمەوە کە پایەی لە مەراسیمی زەردەشتیدا هەیەو نەشزانراوە لەکۆندا بەچی گوتراوە ، کەچی بۆم دەرکەوت کوردییەکی کلاَش خواری پەسەندە .

ئەم ووشەیە ( برسم ـ بەرسەم ) ە . بەپێی ئەوەی کە لە یسنا ٢٥ ، بند ٣ ی ئاڤێستادا هاتووە urvaram baresmanim بەواتای : بەرسەمی درەخت یان گیا ، دییارە ڕووەکە . لە کتێبی مزدەیسنا ...ی ناوبراو هەر لە لاپەڕە ٤٠٠ هەتا ٤١١ لەسەر بەرسەمی نووسیوەو دەڵێ لای کەس مەعلووم نییە کام ڕووەك بەرسەمە . دەشڵێ ووشەی baresmanی ئاڤێستا لە ووشەی barez بەواتای نمو کردن هاتووە . ئەم barez بە ئاشکراتێمان دەگەیەنی کەبەرسەم هەمان ( باڕێزە )ی کوردییە کە بەدەوری ئاوی ساردو لە سێبەردا حەز بەڕووان دەکات . لەدەمی مەراسیمی دوعا خوێندندا هیربەدێکی سەرپەرشتی کەری ئاگر چەند چڵە باڕێزەیەك بە یەکەوە دەبەستێتەوەو دەستاو دەکات هەتا دەگەڕێتەوە جێگای خۆی لە ( بەرسەمدان )دا ، مووبەدیکی دیکە دوعاکان دەخوێنێ . لە ووشەی urvaramدا کەرتی ( rva ) پێیەوە دییارە کە ( روا )کەی کوردییە . چەند جێێ سەیر پێ هاتنەکەدا تا ئێمرۆکە یاخود تادەمی نووسینی کتێبەکەی

مزدەیسنا .. نەزانرابێ بەرسەم بارێزەیە ، تومەز زمانی کوردی بەھەند هەڵ نەگیراوە لە لایەن زاناکانی زمان‌و مێژوو بایی ئەوەی ناوناوە لە تەنگانەدا سەرێکی پێدا بگیرێ . هەر ئەم نائاشنایی نێوان زاناکان و زمانی کوردییە وەهای کرد کە لەدەمی باس کردنی ووشەی ,pashush-haurvastan fshu, pasu کە لە ئاڤێستادا بەواتای خوردە ئاژەڵی ماڵی هاتووە بە بیریاندا نەیەت کە ئەم ووشەیە لەکوردی‌دا تائێستە لە شکڵی ( پەز ) زیندووە ،هەر ئەوەندەیان زانی کە ( چوبان )ی فارسی لەو ووشەیە وەرگیراوە ، خۆ ( شوان )ی کوردیش پتر دەقی کۆنی پاراستووە چونکە دەنگی ( ش )ی ( فشو )ی وەکوو خۆی هێشتوّتەوەو نەی‌کردووە بە ( چ ) . فشووان یان پەشووان بوّتە شووان ... [ بنۆڕە لاپەڕەکانی ٢١١ ، ٢١٤ ، ٢٢٦ ، ٢٤٥ لە فرهنگ ایران باستان ] . مەبەس لە pashush-haurvastan ئەو قانوونانەیە کە لە بارەی سەگی بەر مەڕ داندراوون مافەکانی دییار کردووە .

لە لاپەڕە ٣٨٠ی مزدەیسناو ادب پارسی ، پەراوێز ٢ ، ووشەیەکی نرخدار خۆ بەدەست فەرهەنگی دێرین‌و نوێی کوردییەوە دەدات . ئەم ووشەیە لە ناوتوێژی باسی ( کستی ، کشتی ـ کوستی ، کوشتی ) کەوا هەر لە لاپەڕە ٣٧٦ هەتا ٣٨٩ی گرتوّتەوە ، هاتووە .

دەبێ بڵێم کوستی ، کوشتی فارسی کە لە kostikی پەهلەوی وەرگیراوە ئەویش لە kostی ئاڤێستاوە هاتووە بە واتای تەنیشت ، کنار کە لەلاتینی costaو لە ئینگلیزی coastو لە ئەڵمانی kusteو لە فرەنسەیی costeی پێ‌دەڵێن ، ئا ئەم کوستی ، کوشتی‌یە پشتێنێکە لەتەمەنی پازدە ساڵەیی ( بەپێی تەعلیماتی ئاڤێستای کۆن ) دەخرێتە کەمەری گەنجی زەردەشتی ، هەر لەو دەمەشدا کورتەکێك وەیا وّشاکێکی کە لە کتێبەکەدا ( صدره ـ واتە صدریە )ی پێ دەڵێ لەبەر گەنجەکە دەکرێت‌و لەگەڵ

مراسیمی تایبەتی‌دا تەمەنی منداڵی بەجێ دەهێڵێ بۆ کامڵی ی گەنجایەتی .
ئەوەی لێرەدا مەبەستە ناوی ئەو ( صدره ـ صدریه )یە کە لە پەراوێز ٢ ،
لاپەڕە ٣٨٠ لە بارەیەوە دەڵێ : نیز پوشیدن صدره ( که در پهلوی shapik
آمده ) ـ که جامه مخصوص بهدینانست ـ واجب شمرده شـده . واتا :
هەروەها لەبەرکردنی صدره ( کە لە پەهلەوی shapik « شەپك » هاتووە )
ـ کە جلکێکی تایبەت بە بیهـ دینانە ـ بە واجیب ژمێرراوە .

ووشەی ( شەپك ) کە ( صدره ـ صدریه ـ پۆشاکی سینگ ) بێت
دییارە ئەو شەپکەیە کە لە ( شاڵ و شەپك )ی بەری بادینان دەی بیسین و لە
بەری سۆران ڕانك و چۆغەڵی پێ دەڵێن . لەو لاپەڕەیەدا قسە لە بەند ١١ ،
فصل یەکەم ، کتابی سێیەمی ( نیرنگستـان ) دەهێنێ کە دەڵێ : دەشێ
کوستی لە خوری مەڕو مووی بزن یان ووشتر بهۆندرێتەوە . لە بـەندی
١٢ی هەمان فصل هاتووە : سۆشانس [ مفسرێکی ئاڤێستای سەردەمی
ساسانییە ] فەتوای داوە کە لە پەمۆش دروست بکرێ . لە فصل چوارەم ،
بەندی یەکەم ، کتێبی شـایست نەشـایست هاتـووە : ناشێ کـوستی لە
ئـاوریشم بێ بەڵکـوو پێویستـە لە خـوری یـان مـوو .. بێت . لەمـەوە
دەردەکەوێ کە خۆڕایی نییە هەتا ئیستـاش ( شاڵ و شـەپك ) لە مـوو
دروست دەکرێت . یەوەی بە مەبەست گیراوە لە مەراسیمی زەردە شتییان
تەنها شەپکە ، هەرچی شالە چی دەبێ بـابێ کێشەی بـەدوادا نایـەت
هەرچەند وەهام دێتە بەر زەین کە شاڵ لەگەڵ شالوار خزم بێت چونکـە
هەردوویان لەپێ دەکرێن و فۆرمیشیان لە یەکدی نزیکە ، بەلام بڕیەی لێ
نادەم .

ووشەیەکی دیکەمان هەیە زۆر بەسەیری دەگەڕێتەوە بۆ کۆنترین
بەشەکانی ئاڤێستا ، کە ئاڤێستا خۆی بریتییە لە پێنج بەش [ ل ، ١٩٥
مزدەیسنا ... ] :

١ ـ یەسنا ٢ ـ ویسپرد ٣ ـ ڤندیداد ٤ ـ یشتەکان ٥ ـ مزدەئاڤێستا .

بەشی هەرەکۆنی ئاڤێستا لە ( یسنا ـ یەسنا )دا هاتووە بە ناوی ( گاثا ) . ئەم ووشەیە لە سانسکرێیشدا Gatha هاتووە . لە هەردوو سەرچاوەی ئاڤێستاو سانسکریتیشدا گاثا بەقسەی هۆنراوە ، شیعر ، گوتراوە . لە لاپەڕە ١٩٦ی کتێبی ناوبراودا لە بارەی واتای گاثاکانی ئاڤێستاوە دەڵێ ( سروودو نظمو شعر ) . دییارە سرود بەدەنگی بەرز دەخوێندرێتەوە . لە هەموو ڕوویەکەوە دییارە کە ( گاثا ) لە کوردی سەردەمدا بەسەر زاری ئێلی دزەیی دەوری هەولێر و مەخموور لە شێوەی ( گاس ) ماوەتەوە کە دەڵێن ( گاسی بکە ، گاسم کرد ) بە واتای : بانگی بکە، بانگم کرد . دەمێکە دەنگی ( ث ) لە کوردی‌دا گۆڕاوە بە( س ) مەگەر لە هەورەماندا مابێت ، بۆیە گۆڕانی ( گاث ) بە ( گاس ) کارێکی ئاسایی و ناچاریشە . کەسێکی بڵێ ( گازی بکە ) هەڵەی کردووە . ئەم ووشەیەم لە بەرایی ساڵەکانی حەفتاکاندا لەگەڵ هەژار و زەبیحی باس کردووەو هەرسێکمان بەو ڕایە ڕازی بووین .

لە کۆتایی ئەم گوتارەدا مە ترسی بەڵێنە باس کراوەکە پێمی کورت دەکاتەوە ، سەرەنووکی ووشەیەکی ئاڤێستا دەکەم بە دوعاخوازی ناچاری بە ئومێدی ئەوەی لە هێنانەدی بەڵێنەکەدا بە هەناسەی درێژترەوە وتوویژی ڕیشە دۆزی بکەین .

لە پەراوێزی لاپەڕە ٣٥٦و ٣٥٧ ، لە کتێبی مزدەیسنا ... دا باسی دابەش بوونی شەووڕۆژ بە پێنج کات لە ئاڤێستادا دەکات ، لێرەدا تەنها ئیشمان بە دوو کاتەوە هەیە لەو پێنجانە :

بەشی دووەم کە نیوەڕۆیە ( Rapithvina )یە پێ‌دەڵێت .

بەشی سێیەم ئەو زەمانەیە کە ڕۆژ بە پایان دەگـات ناوی لێ دەنێ ( Uzayeirna ) . ئەم ووشەیە بریتییە لە پاشگـری ( ina ) کە لە ووشــەی پێشـووتریش دەرکـەوت و لە ayar بەواتـای ڕۆژو لە پێشگری uz . ئـەم ( ئوز )ە بە واتای هەڵگرتن ( برداشتن ) دێت کە بریتییە لە تواناو هێز . ئێستاکە لە سلێمـانی ( uz ، ئوز ) لە فـۆرمی ( ووزە ) بەکـار دێت کە دەتگوترێ : لە ووزەی منا نییە . دوور نابینم( هێز ) خۆیشی بەشێوە گۆڕی لە ( uz ، ئوز ، ووزە )وە کەوتبێتەوە بەتایبەتی کە دەزانین گۆڕانی دەنگی هەمزە بە ( هـ ) لە کوردیدا زۆر بەرچاوە .

تێبینی لەبارەی ڕیشەو ڕیشاڵەوە :

ڕیشە : تاکە یەك ڕەگی ڕووەك .

ڕیشاڵ : سەرلەبەری ڕەگەکانی تاکە ڕووەك .

ڕیشەڵان : ڕیشاڵی چەندین ڕووەك تێك ئاڵابێت .

ئەو جۆرە تێکەڵیەمان دە ساڵێکی خایاند، چونکە ئەو بۆ هاوبەشی کردن لە (کۆماری ئۆزبایجانی کوردی)دا، چوو بۆ (مەهاباد)و، لەوێ کرایە، مامۆستاو بەرهەمی هەڵبەستو پەخشانی لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەوسای ئەویدا بڵاو ئەکردەوە کە زۆریان هێشتە نەکەوتوونەتە دوا دیوانەکەیەوە،[1] جگە لەوەی بە فرمانی تایبەتی و ڕاسیاردەی پێشەوا (قاضی محەمەد)ی سەرکۆمار هەموو رۆژی هەینیان و هەفتەیەی لە مزگەوتێك بەر لە نوێژی هەینی ووتارێکی نیشتمان پەروەری و ئایینی ی ئەخوێندەوە کە بە داخەوە ئەو ووتارانەی هێشتە بڵاو نە کراونەتەوە.

من و (قانیع)یش هەرچەند زۆر لێك دوور کەوتبووینەوە، بەڵام نامەو نامەکاریمان لە نێواندا بە هێزبوو، هەمیشە ئاگەداری و گۆڤارو رۆژنامەو چاپکروانی ئەوێی بۆ ئەناردم، هەر لە سەر ئامۆژگاری ئەویش بوو کە نەچووم بۆ ئەوێ چونکە بۆی نووسیم:- (برا.. ئەوی ئێمە لە عیراق ئەمانزانی، داخی بە جەرگم، لێرە وانیە. ئەوا من لە خۆما سەر لێ شێوام، بەڵام تۆ سەر لە خۆت مەشیوێنە، وام لە بەر چاوە زۆری پێ ناچێ ڕێی ی گەڕانەوە بەر هەموان بکەوێ، منیش ئەگەر ژیانم نصیبی گەڕانەوەی بە بەرەوە مابی، ئەوا یەك ئەگرینەوە...) ئەنجا وەك فەرموودەکەی ئەو، بە داخەوە وەها دەرچوو، بە تایبەتی لەم دواییەشدا (پێشەوا) کەمێ لێی دڵگیر کرابوو، ناردبوویە گوندێکی نزیك (مەهاباد) بۆ مامۆستایی.

کاتێ (قانیع) هاتەوە ئیتر زۆر یەکمان ئەگرتەوەو بە تایبەتی لە: (50 تا: 60) ە کانی ئەم چەرخەدا لە پێنجوین و پردێ و شەقلاوەو حەویجەو کەرکوك و کفری بووم و لەوە پاشتریشەوە کە لە بەغدام هەتا چەند مانگێك بەر لە کۆچی دوایی: 1965/5/7ز. هەر سەری لێ ئەدامو هەر جارەی چەند شەوێکمان بە کوڕی وێژەییەوە بە سەر ئەبرد. پەڕاستی دۆست پەردەرو، حەق گوو، وەلام کوتوپڕی و لە جێی خۆیابوو. دەستی نوکتە بازیشی هەبوو.

لەم رۆژانەدا بە دوای هەڵبەستێکی ماموستا (نەجمەدین مەلا)دا ئەگەڕام کە ئەویش چاپ نەکراوەو، بە ڕێکەوت لەو پەڕە بشرو پەڕیووتو پەڕاگەندانەمدا (نامەیەکی قانیع)م دۆزیەوە کە لە هاوینی: 1946ز. دا لە (مەهاباد)ەوە بۆی ناردووم لە گەڵ یەکێ لەو ووتارانەیدا کە لە مزگەوتەکانی ئەوێ ئیخوێندنەوە، ئەوە هانی دام لەوانی دیکەی بگەڕێم، بەڵام ئەوانم بەر هەدێل، نەکەوتن و لە جێگەی ئەوان دە پارچە هەڵبەستی چاپ نەکراوی (قانیع)م

دۆزینەوە ئەوا لەگەڵ وێنەیەکماندا کە پێکەوە لە کوتایی زستانی: 1964ز. دا لە پاڵ (جوندی مەجهوول)ی کۆنی (بەغدا)دا گرتوو مانە پێشکەشیان ئەکەم. پێم وایە ئەوە دوا وێنەی بێ.

وەك لە سەروتاوە نیشانەم بۆ کرد کەوا، زۆر؛ بەرهەمی (قانیع) لە گۆڤارو ڕۆژنامەو پەڕاویاند بلاو کراونەتەوە؛ کە بەر دیوانەکەی، نەکەوتوون. هەر وەك گەلێ هەڵبەستی چاپ نەکراوەی کۆن و نوێیشی لەم یا ئەم کەشکۆڵ و پەڕە شڕو بیری خەڵكدا ماون. وە منیش دڵنیام لەم دە پارچە هەڵبەستەی ئەو پترێکم لا هەیە، جارێ هەر ئەوەندەم بەدەستەوە هات.

بەر لە پێشکەش کردنی بەرهەمەکانی نیشانە بۆ سێ هەڵبەستی تری ئەکەم کە لە ڕۆژنامەی (ژین)دا بلاو کراونەتەوەولە (دیوان)ەکەیدا نین:ـ

1 ـ (ژین)، ژمارە: 673 ڕۆژی: 1942/6/25ز.دا لە ژێر ناوی (من و «کوتەك»ی کوڕم و خەرافاتی کۆن و تازە)دایە.

لێرەدا نامەوێ ئەم بیرەوەریەم ببەمە گڵەوە کە ئەم هەڵبەستە دوو بەش بوو؛ یەکەمیان «قانیع» باس لە منالی ی خۆیو خوێندنی کۆنی وەك ئەفسانەی (جەجاڵ)و (حووچ) ئەکات. وە بەشی دووەمی لە زانستی تازە ئەدوێ کە دوورە لەو ئەفسانانەوەو ئاڕاستەی (کوتەك)ی کوڕی ئەکات بۆ مل دانە خوێندنی تازە.

کەچی کاتێ ڕۆژنامە کە دەرچوو لە جێگەی نیوەی دووەمی سێ تاك و نیوی (پیرەمێرد) چاپکراوە لە دژی هێتلەو نازیێتی.

(قانیع) لەوە زۆر دڵگران بوو، پێکەوە چووینە (قەلەندەر خانە)ی پیرەمێرد، کە وەلامی ئەوەبوو: (ئەو نیوەی دووەمە لە ناو دەستو پێی پیت ڕێکخەری چاپخانەکەو پەڕە شڕەکاندا گوم بوە چونکە نیوەی یەکەمەکەش چاپکراوە نیوەی دوەم دیارنەبوەو کاتیش بەبەریەوە نەماوە بۆ تەواو کردنی ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامەکە بۆیە خۆی بەو تۆزە هەڵبەستەی تەواویکردوە).

قانیعیش هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە ووتی: (خاڵە من لە چل[٢] ڕۆژەی تەمەنمەوە بە؛ ستەم ڕاهاتووم بەلام منوو هێڵەر کوجا مەرحەبا ؟؟..)و کۆڕەکە گوێزرایەوە بۆ ئاسمانێکی ویژەیی.

(قانیع)یش ئەو هەڵبەستەی تازە دانابوو، نوسخەیەکی دیکەی لا نەمابوو، هێشتەش نەهاتبوە بەری ئیترئەو نیوەکەی هەروا چوو. پیرەمێرد ئەم دەسکاریانەیشی هەبوون و زۆریان ئاگە دارم.

2 ـ هەڵبەستێکی دیکەی «قانیع» کە لە (ژین)ی، ژمارە: 770 رۆژی: 1945/1/4 ز. دایە کە لە دیوانەکەیدانیەو بە ناوی (نامەیەك بۆ موفتی تووتنچی ی پێنجوین) ەوەیە، کە لە پاشترا (موفتی) یش وەڵامی دایەوە.

3 ـ (ژین)، ژمارە: 1131 رۆژی: 1953/1/8 هەڵبەستێکی (قانیع)ی تیایە بە بۆنەی مردنی هۆنەری مەزنمان و هاواڵی گیانیم بەختیار زێوەرەوەکە لە سەر گۆڕەکەی ووتوویەو نەکەوتۆتە دیوانەکەیەوە.

جارێ وەك ئەڵێن دەستم لە هەویرەو هەر ئەوەندەیم لە بیرەو نۆرەی پێشکەش کردنی هەڵبەستە چاپ نەکراوەکانیەتی:ـ

١ ـ هەڵبەستی یەکەم کە لە دوو سەرچاوەوە دەستم کەوتوە:ـ

یەکەم ـ لە کەشکۆڵە گرنکەکەی مامۆستا (مەلا عەزیزی ڕێشاوێ)، لاپەڕە 20یدا کە لە قەبارەی: 17 × 20سم دایەو نزیکی: 140 لاپەڕەیەو لە ساڵانی: 1313 تاکوو: 1358 ك: دا بەرامبەر بە 1895 — 1939ز. دا نووسیویەتەوە کە ئوفسێتی ئەو کەشکوڵە هی مامۆستا (محەمەد عەلی قەرەداغی)یەو سەرەناوی هەڵبەستەکەش (کلام قانع)ە.

دووەم ـ لە کەشکۆڵێکی دەسنووسی هۆنەر مامۆستا (شێخ عەبدولرەحمان کاکە)ی سلەیمانی کە ناز ناوی (نەسیب) بوو لە ساڵی 1925 ز. دا ئەو کەشکۆڵەیانی نووسیوەتەوە لە قەبارەی 10 × 8سم دا لە: 80 لاپەڕەدا و بەرگی چەرم تێگیراو بوو، من لەپسپۆڕی وێژە مامۆستا (محەمەد عەلی (کوردی) عەقیدی کۆنە (ئامیر حامیە)ی (سلەیمانی)م وەرگرت لە ساڵی: 1938ز. دا لە سلەیمانی و ئەم هەڵبەستەیم لە بەر نووسیوەتەوە. لە ژێر ناوی (لە خۆش ئامەدی شێخ مەحموود دا ـ قانیع) دا نووسراوە: وە من لە بەراووردی ئەم دوو سەچاوەیەدا دووەمە کەیانم کردە (بنکە).

ئەم هەڵبەستەش لە سەر (کێش) و (پاشبەند) و (شێوە)ی هەڵبەستە بە ناوبانگەکەی (نالی)ی بلیمەتە کە لە کاتی خۆیدا بۆ دوا پاشای بابان (ئەحمەد پاشا)ی ووتوە کە لە جێگەی باوکی دانراوەو سەرەتاکەی:ـ

(تا فەلەك دەورەی نەدا سەد کەوکەبی ئاوا نەبو)ە[٣]

وە ئەم هەڵبەستەی (قانیع)یش بە پێی (سەرەناو)ەکەی کەشکۆڵی دووەم بۆ (خۆش هاتنەوەیەکی شێخ مەحموود)ی داناوە. بەڵام ئایا ئەبێ کام خۆش هاتنەوەی بێت ؟.

ئەبێ بزانین (قانیع) لە ساڵی: 1898ز. دا لە دایك بوە، کەشکۆڵی یەکەمیش لە ساڵی: 1939ز. دا کۆتایی هاتوە. ئەگەر (قانیع) لە: 13 ساڵی‌یەوە کەوتبێە هەڵبەست دانان ئەوا ئەم هەڵبەستەی لە نێوان ساڵانی: 1911 — 1939 ز. دا داناوە.
لە ناوەرۆکی هەڵبەستەکەیشدا چەند ووشـەیەکی وەك(دەوری گێتی)، (سـوارە) (پێتـەختی سلەیمـانی)، (ظولـمـەتی دونیـا) (لەیلەتـول ئـەسـرا)، (دەربەند)، (دەشتی بازیان)،(مەحموود) وە (تانە)ی تیایە، کـە ئەمـانە شـاد بوونەوەیەکی (قانیع) بە (شێخی مـەزن) ئەگـەیەنن‌و دیـارە ئەم ووشـانەش پەیوەندیەکیـان بەو (خـۆش هاتنـەوەیە) وە هـەیە. وەك مِن بـۆی ئەچم ئـەم هەڵبەستەی دوای جەنگی دەربەندی بازیان داناوە کە لە نێوان شۆرشگـڕانی کورد بە سەرۆکایەتی (شێخی حەفید)و سوپای دڕندەی ئینگلیزدا لە 18-1922/6/22 ز.دا ڕوویداوە کە بە برینداركرانی (شێخ)و بە دیـل گرتنی لە بن (بـەردە قارەمان)داو فرمانی خنکـاندن بـە سەرا دانی‌و نـاردنی بۆ شـاری (تانـە)ی (هیندستان) لە گەڵ (شێخ محەمەد غەریب)دا کۆتایی هات. بەڵام لە مەترسی کردن لە بێزاری‌و قینی کورد؛ ئینگلیزەکان نەیان وێرا بیخنکێنن‌و لە 1922/9/22 ز.دا گێـڕایانــەوە شاری (سلەیمـانی)ی (پایتـەخت) لە فـەرمـانـڕەوایێتی جـاری دووەمیدا.[٤] کە گومانم لەوەدا نیە (قانیع) ئەم هەڵبەستەی بو ئەو هاتنەوە خۆشە داناوە و پێشکەشی شێخ مەحموودی کردوو وەك لە لێکدانەوەی دواتاکیا دیارە .

بۆ پشت گیری تر کردنی ئەم ڕایەشم هانا بۆ ئەم دوو خاڵە ئەبەم:-
یـەکەم - (قـانیع) زۆر خـۆشەویستی بـەگزادەو ئـاغـاو شێخـەکـانی (کوردستان) بوو، لە گەڵ ئەوەشدا جـار جارە ئـەو بە هـەڵبەست لە سـەروو پۆتەڵاکیانی داوە بەڵام ئەوان هەر چاوێرییان کردوەو بە ڕێزەوە لە ناویاندا ژیاوە، ئەوەش لەوەوە نەبوە کە (شاعیر) یێك بوەو لە دەمی ترسابن وە یا بۆ دەمکوتانە بووبێ وەك ئەوی لە (شێخ رەضا)ی تاڵەبانی ترساون، چونکە (قانع) ئـەگەر (هەجو)یشی کردبن بریتی بوە لەوەی دەستی خستۆتە سەر خـراپیەکـانیان و ڕێگەی ڕاستی بۆ داناون‌و لە ئاکامی خراب هەڵی سڵەماندوونەتەوە، نەك وەك (شێخ رەضا) جنێوی پیسی دابێ‌و سووك‌و ترۆی کردبن. بە تایبەتی وەك خۆم ئاگەدار بووم و لە خودی قانعیشم بیستوە هەر لە سەرەتی فەقێیەتی‌یەوە (شێخ مەحموود) (قانیع)ی ناسیوەو خۆشی دیستوەو ڕێزی لێ گرتوەو چاوێری کردوەو،

وەك بڵێی پەیوەندیەکی (گیانی)ش لە نێوانیاندا هەبوە سەرەڕای ئـەوەی کە (قانع) لە بەرەشێخێکی ناودار بوەو (شێخ مەحموود) یش ئە وشنانەی بەر چاو ئەگرت.

دوەم ـ کـاتێ (قانیـع) زانی ی من لە ساڵی: 1922 ز. دا لە دایـك بـووم پێکـەنیو، ووتی: (من ئەو سـاڵە فەقێیـەکی گەنـج بووم لە (سلەیمـانی) کە پێشوازیە گرنگە کەی (شێخ)ی تیا کرا کە لە (هیندستان)ەوە بە فەرمانڕەوایی گەڕایەوە.).بەلام باسی ئەم هەڵبەستەیم لێ نەبیستوە دیا رە ئەویش لەوەوە بوو خۆی هەڵئەکێشا. ئەم ساڵی هاتنەوەیەی (شێخ)ەش پشت گیـری‌یەکی تـری بوونی «(قانیع)ە لەو ساڵەدا لە (سلەیمانی)و لەگەڵ دانانی هەڵبەستەکەی بۆ پێشوازیو خۆش هاتنەوەی (شێخ)دا یەك نەگرنـەوە کە ئـەو سایـە تەمـەنی (قانیع): 24 ساڵی بوەو ئەوش بەس بوە کە لە هۆنەریدا بچێتە جەنگی (نالی) یەوە بەو هەڵبەستەی کە لە (شێوە و (کێش)و (پاشبەند)ی هەڵبەستەکەی (نالی بوەو لە دەستووری ویژەی کـۆنیش دا بەوجـۆرە هەڵبـەستە هـاوچەشن (ڕەدیف) ووتراوە. ئەمیش هەڵبەستەکەیە:ـ

## (لە خۆش هاتنەوەی شێخ مەحموودا)

تـا کو عـەطری گوڵشـەنی، پڕ سـەوسـەنی پـەیـدا نـەبـوو؛
دەوری گێتی، پـڕ فەرەح، وەك (یـەثریب)و (بەطحا) نەبوو.[٥]
تـا سوارەی پـەرچـەمی نـەڕژایـە سـەر حـەفحـەی حـەمـاڵ،
کـاتـبی بـادی صـەبـا، پـر نـەشئـەوو شـەیـدا نـەبـوو.
تـا نـەهـەنگی دڵ، بـە قـوللابی مـوژەی ئـەو دەرنـەهـات؛
مـەجمەعـولبەحـرەینی سینەم، شـەق؛ وەکوو دەریـا نـەبـوو.[٦]
تـا لە نێو (تـانە)ی (مـەحاق) دا بـوو، بڕۆی چـەشنی هیـلال،
خونچەیی دڵ، عەینی (پێ تەخت)ی (سولە یمان)؛ وا، نـەبوو.[٧]
تـا لە سـەر، (گـوڵ تـۆپ)ی کـوڵـی، وا نیـقـابی لا نـەدا،
ظولـمـەتـی دونیـا، مـیثـالی (لەیـلەتـولئـە سـرا)؛ نـەبـوو.[٨]
تـا لە (دەربەنـد)ی دەروونم، خاری خـوزنی هـەڵ نـە کـەنـد،
دەشتی سنگـی (بـازیـان)م، جـەننـەتـولـمـەئـوا نـەبـوو[٩]
تـا لە بازاڕیـا فەلەك، (مـەحموود) و (خـەزنە)ی جـەم نەکـرد.
جەژنی (قانیع) مونحەصیر، با: (قوم فـەئەنـذیر) هـا نەبـوو.[١٠]

2 ـ ئەم هەڵبە ستی دوەمی چاپ نەکراوی (قانیع)ەم لە لاپەرە: 138 ی هەمان کەشکۆڵەکەی (مامۆستا ڕێشاوێ) وەرگرتوە. کە ئەم هەڵبەشەیـان لە شێوەی (مەسنەوی) دایە، واتە: لە کێشدا دە بڕگەیی و لە پاشپەنەدا بە زۆری، هەر، تاك (بەیت)ەی پاشبەندی جیای لەوانی تری هەیە هەر چەند وایش، ئەبێ پـارچە هەڵبەست هەمووی لە سەر یە ك جۆرە پاشبەند (سەروا ـ یا ـ بەشاڤەند ـ یاـ بە رشاوەند ـ یابەس بەند)ە.

هەر وەها ئەم هەڵبەستی دووەمینەی؛ (قانیع) بە (زارگوت ـ لەهجە)ی هەورامانی (هەورامی = گۆرانی)و وتویەتی، لە ژێر سەرەناوی (کلام قـانع برای شیخ محمد نویشته)؛ واتە: (ووتە قانیع بۆ شێخ محەمەدی نووسیوە).

لە کۆتایی هەڵبەستەکەشدا لە کەشکۆڵەکەدا نووسەرەکەی نووسیـویە: (تحرير شد از شب: (5) شنبه، سعات: 7 در ماه رمضان سنه:(1353 هجری،: 1434 میلادی). واتە (کات ژمێری حەوتی شەوی پێنج شەممە لە مانگی ڕۆژووی ساڵی: 1353 ك، بەرامبەر بە: 1953 ز. دا ئەم هەڵبەستە نووسرایەوە.)، بەلام ئەو (شێخ محەمەد)ەم بۆ ئاشكرا نەبـوو، کە: کێیـە ؟هەر چـەند بـە هی دەورو بەری (هەڵەبجە)و (هەورامان)و بـە تایبـەتی (تەوێڵە)و (بیـارە)ی ئەزانم کـە دیارە دۆستێکی ئـەدەبدۆستی (قـانیع) بـوەو، ئەوسـایەش هـەڵبـەست دانـان بـە (زارگوت)ی (گۆران)ی باو بوەو، هەڵبەستەکەشی؛ وا پێدەچێ کە ئەو (شێخ)ە دلخوازەکەی (حەسەن) نـاوێك مـارەی کربێ‌و، (قـانیع)یش وەستـایانـە ئەو پێناخۆشیەی (شێخ)ی بە ناو بردنی هەندێ ڕەوشتی خراپی چەند ژنێـك خاو کردۆتەوە کە شارەزایی خۆی تیا ڕاگەیاندووە لە و (زارگوت)ەو لە مێژوویشدا. هەرچەند من ئاگەدارم کە ئەو شارەزای هەورامی کۆن بوو کە ڕەقتـرە لە هی ئێستە.

لە ڕووی دیاری کردنی کاتی نووسینی هەڵبەستـەکەوە نـووسەر تـەنیا نووسیویە (شەوی پێنج شەممەی ڕەمەزان) و ئاشکرای نەکردوە کـام. (پێنج شەممو)؛. کە من ساغم کردەوە پێنج شـەموەکـانی ئەو مـانگە بـەر ڕۆژانی: (24,17,10,3)ی ئەو مانگە (هیجری) = (کۆچی)یە ئەکەون و بەرامبەرن بەڕۆژانی: (25,18,11,4)ی مانگی (ئاب)ی ساڵی 1934ی[11] زابینی. کە دیارە ئەمهەڵبەستە لە یەکێ لەو چوار ڕۆژەدا نووسراوەتەوە، وە هەڵبەستەکە بەر لەو کاتە دانراوە، کە ئەمەیە:ـ

## هەڵبەستی قانیع بۆ شێخ محەمەد)

ئازیز زویری !! ئازیز زویری !!
دوور با، جه گیانت، ماچان زویری !![12]
جه بازیچەی چەرخ، چەپگەرد دڵگیری ؟
گیرۆدەی مەینەت، بەند زنجیری ؟؟.

* * * * * * * *

شنەفتەم، دوور با، ئێش چەم داری،
(فروفردانە)، دەرد و خەم داری.[13]
باز؛ بێ وەفا، چەرخ چەپ کردار،
شانا، مۆری نەرد، وە سەد قینو قار[14]
ئەو نەو ڕەس نەو هاڵ، باغەکەی شادی،
ئەو سەروی جۆبار، ڕەوضەی ئازادی،[15]
ئەو باز شەش دانگ، تەڕلان تەوار،
ئەو قامەت عەرعەر، ئەو خەلف چنار[16]
ئەو غەزال وەحش، سەرعێل جەیران،
ئەو صەید بێ خۆف، ڕەوییەی هەردان،[17]
ئەو کەبك پر خاڵ، قەهقەهەی کۆسار،
ئەو گولدەستەی تەڕ، سەر بەزم گولزار؛[18]
چەرخەکەی بەد خوو نە داش وە ئازیز،
سارد کەرۆ مەیلەش، چون ساردی پاییز.[19]

* * * * * * * *

داش وە (حەسەن) نام، گیرۆدەی خەس بۆ،
پامال زەحمەت، جۆش هەرەس[20] بۆ
دەك رۆحەش هەوای گۆڕ تەنگ کەرۆ،
هوونەش، پەردەی عەیش وەصل ڕەنگ کەرۆ[21]
نەکێشۆ پەنجە، نە تۆی یەخەی ناز
نەنیشۆ هەرگیز چەنیش وە دڵ واز[22]
ماچ نەکا لەبان، وێنەی پەڕەی گوڵ،
نەگیرۆ چەنێش؛ مەقصوودات[23] دڵ.

* * * * * * * *

با ووجوود ئازیز !! یاران بێ مەیلەن،
هەرکەس (مەجنوون)ە؛ ئەوان هەر (لەیل)[24]ەن.
ویەرد بە ئەحوال، خەرابەی ئادەم،
حەضرەت (حەو، وا)، (دێك) ی كول عالەم.[25]
چ ئیصرارەش كەرد؛ پەی گەندوم خواری،
(یاونا) ئادەم وە شەرمەساری[26]
یا (حەرەم) (لووط)، كارەش چ طەور بی ؟
چەنی مسافر، وە جەفاو جەور بێ.[27]
(شیرین ئەرمەن)، (فەرهاد) فەنادەر،
پەی قەتڵ (خوسرەو)، (شیرۆ) بەیا[28] كەر.
هەر مەگەر (ژن) بی، (صەنعان) فریب دا،
(هاڕووت)و (ماڕووت)، حەپس كریان نە چا.[29]
هەر مەگەر (ژن) بی، (بەلعەم) وەست نە خەم،
(ژن) بی، وە سەبەب؛ (هابیل)و (ئادەم).[30]

* * * * * * * *

باقی وەسسەلام نییەن مەجالم،
بەرێ دەرد تۆ، پەریشان[31] حاڵم.

ئەم هەڵبەستەی (قانیع) لە بەشی ناوەندیدا هەڵبەستە باڵاكەی (حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە)مان دێنییەوە یاد و بەشەكانی دیكەیشی لەو پترن هونەرمەندیانەو پسیۆڕایەتییان تیایە.

3 ـ ئەم دوو هەڵبەستەی پێشوو سەرچاوەكانیان كۆنترو، هی سەرێنی مەلایەتی كردنیەتی لە گوندانی بەلام ئەم هەڵبەستانەی دوایی هی كاتی پێ خوێندنی قوتابیانە لە قوتابخانە میری‌یەكاندا كە لە دیدەنیەكیدا بۆ لام لە (پردێ) لە 1955 ز.دا لەدەمی خۆیم وەرگرتوون كەئەمە یە كە میانە:ـ

# (سروودی نیشتمانی)

وەطەنمان بەجێ ماوە هێزی ئەژنۆی نەماوە
تەواوی لێ قەوماوە
کوردە هیممەتێ سادەی غیرەتێ
تاکەی ئەسیری جەهلی.

* * * * * * * *

عالەم سەربەستو شادە لە بەری خەم ئازادە
عیراقمان بێ مرادە
کوردە هیممەتێ سادەی غیرەتێ
تاکەی ئەسیری جەهلی.

* * * * * * * *

ئەم کوردە دەردەدارە کەنەفتو خاکەسارە
بە خوێندن ئەکری چارە
کوردە هیممەتێ سادەی غیرەتێ
تاکەی ئەسیری جەهلی

* * * * * * * *

ئەم میللەتە فەقیرە بۆیە بێ ڕاو تەدبیرە
لە جەهلدا ئەسیرە
کوردە هیممەتێ سادەی غیرەتێ
تاکەی ئەسیری جەهلی

* * * * * * * *

خوێندن باوك برایە بۆ پشکەوتن چرایە
خوێندان ئەمری خودایە
سادەی غیرەتێ
کوردە هیممەتێ تاکەی ئەسیری جەهلی

هەر (قانیع) بۆی گێڕاومەتەوە کە ئەم سرووودەی سەرەوەو ئەم دوو سرووودەی دوایی‌و گەلێکی تریشی، خۆی ئاواز (لەحن)ی بۆ داناون‌و فێری قوتابیەکانی کردوون بۆ دەرسی گۆرانی. لە ڕاستیدا خۆیشی دەستی (دەنگ خۆشی)ی هەبوو. جار جارە بە لووت ویرە ویرێکی ئەکرد بەڵام بە دەنگ‌و ئاوازێکی دڵگیر. بە داخەوە ئاوازەکانیانم بیر نەماون.

4 ـ ئەم سرووەدەش وەك ئەوی پێشوو هێشتە چاپ نەکراوە:ـ

## (سروودی تێکۆشان)

بەیانە کوردە هەستە
عالەم بە خۆشی مەستە
هەرچی کە بلح‌و سستە
داماوە مات‌و حەیران

هەر بە جوولان خۆشە ژیان
تێکۆشان، تێکۆشان

* * * *

سروەی نەسیم‌و نەغمەی
تەیری بەیانە هەی هەی
تێکەڵ ئەبن وەکوو نەی
ئەڵێن ژیانە جووڵان

هەر بە جووڵان خۆشە ژیان
تێکۆشان، تێکۆشان

* * * *

حەیوانی کێوی‌و ماڵی
ماسی‌و مێروو، و بەباڵی
هەر یەك بە گوێرەی حاڵی
ئەکۆشێ لە ڕێی ژیان

هە ر بە جووڵان خۆشە ژیان
تێکۆشان، تێکۆشان

* * * *

کـاروانی، کـەوتنــە خـۆ
وا جووتیاریش بە: هۆ، هۆ..
شوان ڕوویکردە دەشت و کۆ
قاسپەی کـەوە لە کێوان.

هە ر بە جوولآن خۆشە ژیان
تێکۆشان، تێکۆشان
* * * *

جـوولە نیشـانـەی ژینــە
تێ نــەکـوشن یــەك بینــە
کـارو پیشــە شـیــرینــە
نـازمێـرڕێن بــە ئینسـان.

هەر بە جوولآن خۆشە ژیان
تێکۆشان، تێکۆشان
* * * *

ع ـ ئەمیش هەڵبەستێکی دیکەی چـاپنەکـراوی (قانیـع)ە کردوویــە بە سروود:ـ

## (سروودی بخوێنن)

حـەیفە بـۆ لاوی زیـرەك
گەر عیلم نەکەن بە چـەك
پشت نەدەنە پشتی یــەك
دەبنــە خوێـڕیی لا کۆڵان

بەرەو خوێندن ماندوو نابن
بخوێنن، بخوێنن
* * * *

دەسـا با کێـووو دەشتی
ئـەم وولاتــە بــە گشتی
ڕەنگینی وەك بـەهەشتی
خۆش بێ، بەعیلمو عیرفان

بەرەو خوێندن ماندوو نابن
بخوێنن، بخوێنن.
* * * *

تـاڤگـەیبلووریی ئـاوی
دەڵێن ڕۆڵە گـەر لاوی
هـاژەی چەمو خـوڕاوی
بەرمەدە کـردەوەی جوان

بەرەو خوێندن ماندوو نابن
بخوێنن، بخوێنن
* * * *

لاوان نـەوەی کـیـبـارن
گــەر هی لادێ یـا شــارن
پـڕ هـێـزو پـڕ دەمــارن
هەموو هیوان بۆ کوردان

بەرەو خوێندن ماندوو نابن
بخوێنن، بخوێنن.
* * * *

ئێمــە هیـواو ئـاواتــین
ئـێمــە فـیـدایوولاتیـنی
ئێمــە بــەرەی خــەبـاتـین
بـژی کوردو کـوردسـتـان

بــەرەو خــوێــنـدن مــانـدوو نـابـن
بخوێنن، بخوێنن

٤ ـ ئەم هەڵبە ستەو دوو پارچە هەڵەستی دوایش (قانیع) لە وانە (دەرس)ی لەبەرکردن (مەحفوظات)ی کوردیدا کە ئەوسا ئەخوێندرا داوێتی بە قوییان.

## (شاگردی قوتابخانە)

ئێمە منالێن، شاگردی مەکتەب،
ئەکەین ئەحصیلی عولووموو ئەدەب.
ئێمە سەعیەکەین بۆ سەرکەوتنمان
زۆر چاك ئەخوێنین بۆ پێشکەوتنمان
ئێمە بۆ وەطن گیان فیدا ئەکەین
بە قووەی قەڵەم گەلمان سەر ئەخەین
ئێمە ڕەوشتی چاکە ئەگرین
ڕەگی جەهالەت لە بندا ئەبڕین
ئێمە کە ئیمرۆ لاوی وولاتین
سبەینێ پیاوی جیگەی ئاواتین

١

٢ ـ هەلبەسی :ـ

## ( ڕۆڵەکەی کوردم عیبرەتێ )

ڕۆڵەکەی کوردم بەسیە بێ عاری
سادەی تێکوشن بۆ خوێندەواری

دەرمانی دەردی میللەت خوێندنە
خوێندن بۆ وولات ئاوا کردنە
(غەربی)ش وەك ئێمە نەخوێندەوار بوون
بە دەردی جەهل ژارو بیمار بوون
لە سای مەکتەباو بە خوێندەواری
ڕسگار بوون لە دەست (دەرد)و (هەژاری)
چونکە تێکۆشین، بوونە ئەم پیاوە
ناویان مەشهوورە بە ڕووی دونیاوە
ئێوەش عیبرەتێ لەمە وەرگرن
بەر لەوەی لە ناو زیللەتا بمرن.

8ـ ئەمیش پارچە هەلبەستێکی دیکەی چاپ نەکراوی (قانیع). کە ئـەمجارە پێشکەشیان ئەکەم، ئەم شەش هەڵبەستەی دواییان هی ساڵە چلەکانی ئەم چـەرخەی بـوون‌و ئەم یـەکەشیـانی بۆلە بـەرکردنی قـوتابیـانی پـۆلی (3)و(4) هەڵبەستوە:ـ

## (قوتابی زیرەك)

من منداڵێکی بچووکی کوردم
مامۆستایەکەم وا فێری کردم
هەموو بەیانی کە لە خەو هەستم
پاك ئەشۆم چاوو ڕوومەت‌و دەستم
بەفرو، با، نەبێت سەریشم ئەشۆم
ئینجا بەرچایی چی هەبوو ئەیخۆم

به بەرگی مەکتەب لەشم ڕێك ئەخەم
کتێبو دەفتەر لەگەڵ خۆم ئەبەم
بێ باك بە خۆشی بۆ مەکتەب ئەڕۆم
ڕەوانم کردوە دەرسو دەوری خۆم
ئەچمە ناو مەکتەب لەگەڵ ڕەفیقان
گۆرانی ئەڵێم یاریش ئەکەم جوان
کە وەختێ دەرس بوو ئەچمە دەرسخانە
لە لام خۆشترە لە سەد چایخانە
گوێی لە دەرس ئەگرم ئەیکەمە بەرم
ئەیشی نووسمەوە لە ناو دەفتەرم
جومعانیش سەری خزمو دۆست ئەدەم
بخۆشی و سەیران بەسەری ئەبەم
بۆ لەشو دەستو زوبان هەمیشە
پاك ڕاگرتنم کردوە بە پیشە
حورمەتی داكو بابو کەس ئەگرم
چاکەم کردۆتە پیشە تا ئەمرم
لە مەکتەب فێر بووم ئەم ڕەووشتانە
مەکتەب سەرچاوەی عیلمو عیرفانە
ئاوابێ مەکتەب جێگەی خوێندنە
شوێنی تەربیەی چاك وەرگرتنە
بژی مامۆستام دەرسم ئەداتێ
ئەو ئەمگەیێنێ بە گشت ئاواتێ
ئاواتی چاکە بۆ حزمەت کردن
بۆ گەلو وەطەن بەرەوپێش بردن

9 ـ دیسان لە هەڵبەستی (قانیع)، تاکە هۆنراوەیەکی (فارسی) یەتی کە هێشتە نەکەوتۆتە دیوانەکەیەوە، وە من لە ساڵی: 1941 ز. دا لە دەمی خۆیم وەرگرتوە لە (سلەیمانی)، کە بە بۆنەی لابردنی (رضا خانی پەهلەوی) یەوە (لە پاشایەتی ئێران) دانیاوە، کە ئەمەیە:

## (هەڵبەست)

### تەئریخ سەرنیگون شودەنی شاه پەهلەوی

### خود نام نەحس ئووست: (رەضا شاه پەهلەوی).

واتا:ـ
(مێژووی سەرنیگون بوونی شای پەهلەوی
خۆی ناوی نەگریسی بەخۆیەوەیە کە (رەضا شاهی پەهلەوی) یە.

بەپێی نەریتی ویژەی کۆن (قانیع) لەم تاکە هەڵبەستەیدا وەستایی خۆی بەوەدیاری کردوەکە پیتەکانی (رضا شاەپهلوی) بە رێنووسی کۆن وەبە ژمارەی (ئەبجەدی) ئەکەنە ساڵی ئەو سەرنیگون کرانە بە مێژووی کۆچی (هیجری) وەك:ـ

(ر = ٢٠٠ + ض = ٨٠٠ + أ = ١) و (ش = ٣٠٠ + أ = ١ + هـ = ٥ و (ب «پ» = ٢ + هـ = ٥ + ل = ٣٠ + و = ٦ + ی = ١٠) کە هەموویان ئەکەنە = ١٣٦٠، وە ئەم ژمارەیەش ئەو ساڵی کۆچییە یە کە (رەضا شا) ی تیا لە شاهێتی خراوە، کە ئەویش بەرامبەرە بە ساڵی ١٩٤١ز. جگە لەوەی کە قانیع ئەوەی دۆزیوەتەوە کە ناوەکەی کابرا بە (ئەبجەدی) بەرامبەرە لەگەڵ ساڵی لێخرانی و ئەمەش وورياييەكی تايبەتی پێویستە.

١٠ ـ دوا پارچەیەك لە هەڵبەستە چاپنەکراوەکانی (قانیع)، کە پێشکەشی ئەکەم و (دڵنیام هەڵبەستی چاپ نەکراوی تری ئەوم زۆرتر لایە) دیسان ئەم هەڵبەستەیشی هەر بەهەمان بۆنەی هەڵبەستەکەی پێشووەوەیەتی، (حەمە رەضا) ی کوڕی (پەهلەوی)مان لە شوێنی داناوە، وە ئەمیش هەر لەو ساڵەدا لە (سلەیمانی) لە دەمی (قانیع)م دەرگرت و، دانانی دوو هەڵبەست لەسەر یەك بۆنە بەڵگەی هەستێکی تايبەتيەتی بەرامبەر بەو بەو دوشمنە. کەمیش هەڵبەستەکەیە:ـ

## (هەڵبەستەکە)

لە ناو چاخانەو، جادەو بازاڕا، بوو بە قاوەقاو.
کەڕادیۆ حوکمی، (ڕەضا پەهلەوی) ی، ناوبرد بە ڕووخاو[٣١]
حوکمێکی هێندە، بێ ڕضاو پیس بوو، حەتتا تەنانەت
ئاغای؛ (ئیستعمار)، نەیگرتە خۆی و، کردی ئاوەوئاو[٣٢]
ئەو حوکمە شوومەی، هەر لە (ماد) ەوە، تاوەکوو ئیمرۆ
خەریکی فەوت و، سەرکوتی (کورد) ە، بە سەد چاوەڕاو[٣٣]
لە جێی ئەو (خووگ) ە وا (حەمە ڕەضا) ی، کوڕی دانرا
بێ شکم ئەمیش، وەك ئەو گۆڕ ئەکری و، ئەکەوێتە داو[٣٤]
خۆزگە بەمیش دا، بگەیشتمایە، کە (کورد) ی نەبەرد

تۆڵەی بەرود دوای، (کوردی ئێران) ی، لێ ئەسەند بە تاو[٣٥]
جارێ بۆ ئەویان، با تەئریخ دانێم، گەر منیش نەمام
ڕۆڵەمان زۆرن، تەئریخی ئەمیش، بگرنە بەر چاو
بۆ تەئریخی ئەو، چوومە سەر (تەل) و، بانگم کرد هەلاو
(سەگێك تۆپیوەو، ڕای ئەکێشنە، ناوەندی گەناو)[٣٦]

لەم پارچە هەڵبەستەی دواییدا، ئەگەر پیتەکانی دوا نیو باڵەکەی بە پێی ژمارەی (ئەبجەدی) گرد بکرێنەوە کە:ـ (س = ٦٠ + هـ = ٥ + ك «گ» = ٢٠ + یّ = ١٠ + ك = ٢٠) و (ت = ٤٠٠ + وّ = ٦ + ب «پ» = ٢ + ی = ١٠ + و = ٦ + هـ = ٥ + و) وە (ر = ٢٠٠ + أ = ١ + ی = ١٠ + أ = ١ + هـ = ٥ + گ = ٢٠ + یّ = ١٠ + ش = ٣٠٠ + ن = ٥٠ + هـ = ٥) وە (ن = ٥٠ + أ = ١ + و = ٦ + هـ = ٥ + ن = ٥٠ + د = ٤ + ی = ١٠) وە (ك «گ» = ٢٠ + هـ = ٥ + ن = ٥٠ + أ = ١ + و = ٦) کە هەمووی ئەکاتە ١٣٦٠ و ئەمیش ژمارەی ئەو ساڵی کۆچی یەیە کە (رەضا خان) ی تیا ڕووخێنراوە و (حەمە رەضا) ی کوڕی ئەویان لە جێی داناوە کە بەرامبەرە بە ساڵی: ١٩٤١ ز.

لە کۆتایی ئەم هەڵبەست پێشکەش کردنانەدا (ئیتر ئەوە ئێوەو (نامەیەك) و ووتاریك) ی (قانیع) بە دەسنووسی خۆی. هیوا بارم لە پێزانیما بەرامبەر بەو دۆست و ماموستا مەزنەم لە جاری تریشا بکەومەوە دەرخستنی ئەو کەڵە هۆنەرەمان کە کۆتایی نایەت:

روژی ۳۱ تموز ۱۹۲٦ گه یشتیه دستم هوشنگ

بو برای دلسوز ولاوه ده زمانی و به قیمت کاکه هوشنگ

بنواوی اشتیاقه هردو دستت اگوشم کاغذونا ملکه گیشت زور

ممنون وتشکرتشمان پیروزیم کردیت خدا اشالت زیاد بکات

وسلیمانی آوه دان بی که برای وک تو دلگرم وشتمانی مان

بوبی اگه بیتی کاکه گیان نوسیبوت که تو زور له سلیمانی به خراپ ناوت

ابی خوم ازانم که دعایای کی یه به شوینیه وه هیچ دربستی نیم

وگوی پی ناده م چونمن اگرخانی بم هیچ کاریکم له دست نای وا اگرخادم

بم هیچ کاریکم پی ناکریت قابل هیچ جمع وخرجی نیم کاکه گیان ایسته من همو

روژیک له پیش حلیب دا اچمه سرمنبر لمزگوته جامعه یک سعات ئواو

خلبه ی وجدت و دیانت وملیت اخوینمه وه یا خوا وطنه کمان ۸ خانی

وک منی تیا بیت قه ی ناکات رجا اکم ام سه روژه ی شینی پاشی توتنه

له زور جیگه بخوینه وه ایتر هر بژیت کاکه گیان قانع

**(نامەکەی قانیع بۆ (من بەدەسنووسی خۆی لەگەڵ وێنەیەکی منووئەو وەووتاریکی قانیع بەدەسنووسی خۆی).**

دیاشی خلفای اربعه به بارحلاو میلاد گوررا خدمت بو به سلطنت امانت بد به خیانت و به

هرجور آرزوی خویان بو قانونی مقدسیان بد اگورتی (بوچی) بو آرزوی بعضی چند براین

سیدی معصوم سربرآن ومتوار رخاکی ایران بون والبته علمای او عصره فتوایان لسرآرزوی امرا

بوه جاکوابو بدا یه یی لازمه که همو سالی ۳ روژ شینی پاشی کوتنان ببیت کولو ۳ روژه دا کوملمان

ببیت وعلامتی غاجز یو پریشانی لقبیل ریشی نه تاشین وجلو رش لبرکردن وجا و تر بون بگریان و بی

نکنین و وترکی صندوق گوران وعود لیدان وچیه ریران بکین ولو ۳ روژه داهر یک دسته

سرتی سور ببستین به قولیانوه ولو ۳ روژه دا هر یک بیداخی سور به قراخی بانه کان مانا دخو

ناوه بنین (۲ روژه شین پاشی کوتنی) ولو ۳ روژه دا تماشا بکین که مقرو به بونشتمان

دفعی بکین وکه قانونی بشری ببار خویا اگورتیت بی کوژرین وکه بو غایه شخصی غایه عمومی افوتین بی

خوتی نین وکه بغیره حق ادعا اکات دمی بدورین وکه استحقاق برزی هیه وجیگا نیه جیگا بو

دروست بکین لو روژیکه وه که بنی آدم خوی ناسیوه هرطایفه عادتی کیان بو خویان داناوه که او

عادته یا بو شیونه وقورتیه وانه کا ببیت به سبب قوی بونی معنویاتی او قومه وتشجیعیان اکات ل

سر گریانه وزاری وکو چرچیه وکوتل وزلای قدیم بگزاده جاف یا بو فرح وکیف وکو هلپرکی

وترش بلد که کرژن وپیاو تیکل ابن وهل اپرن که هرگیز اوژن وپیاو نازانن ماندو بون چیه

(۲ روژه شینی پاشی کوتنی) نانیج تواو چرچیه ورش بلد که چون اوان فقط یا دو روژ یا ۲ روژ تاثیرا

و نتیجه یان هیه بلام ام ۲ روژه نتیجه یکی ده هزار سالی دروست اکات و تواوی نشتمان وکومل استفاده

لی اکات (خطاب الگل کوردستانه) ای کوردستان اگرا وللادهکانت هموسالیک ۲ روژه شینی پاشی

کوتنی بکن بعبادت وتی کوشین با جیا کردنه وه پاک و بیسی لیکتر خاطرجم لصدهشتا لخیانت کاران

و بیمشکان و خوینی فقیر و هزار خوران اکوژریت ای کوردستان تماشا اکم هیچ خزایه ی کت نیه

الا امه نبی که محدود و بو تقریبا بو صد نفری ای کوردستان همو نقاطی کوره ارض چیوکه

انقلاب بعضی جار به رزی اکات وبعضی جار دای انوینی تو بوچی هیچ جاری نبوکه به رز

ببیت ای کوردستان (بوچی) ررزاق وثمرت له روی جهان زیاتره

بلام لەوەکانت هەمو برسا امرن اخلاب لەگەل لاوان وتازە پێگەیشتووەکان)

ای لاوان ای پێگەیشتووەکان ای جگرگوشەی کوردستان لاوا وکو یە غم خوری هوزبیت
پێگەیشتوا وکو یە خزمتی فقیرولی قوماوی هوزبعات اوەکەی عالمە خوی پلاوو
گوشت بخوات وبراهاو خوینەکانی لە برسا بمرن اوەکەی زجیمە خوی لەسرقژ ویلە و
دوشکی بەرزلینەی شکمی بدات بە خویا ومندا لە فقیرەکان وکو توتەلەسگی تازە
لەدایک بوو زروکە زروکی لە کولانانا تا بیانەناو قوتراوەکانا بزرو کمی نی اوەکەی ملیت
وکوردیتی پێالینی کەترنە کەی خوی خرجی یک روژحامی بە دوو دینار تواونا بیت بلام
بیوەترنە هاوزمانەکانی وهاو خوینەکانی بە رووی سوورەوە دەدوکان بگریت بو پارەیەکی
کولیرە ای لاوای گنج ای نشتمانی ای زانا ای خوینەوار امە کە قانونی یکیتی وتعصب قبول
اکات تو قوندرەی فتوحی وجزمەی ارکانەحربی لە پێ بکیت ولادییە قور بە سرە کە بە پێ ی
پێ خاوسە بی کوشەوکالە بە بفرە کوتی دا ریتی بە فروشێت بو نانی یک شوی مندالەکانی
جا کوا بو رجا اکم لە هەمو لاوان هیچ کسی رووی نەبیت بلێ من نشتمانیم وخزمتی هوز
اکم چونە بە نشر کردنی گولدستەی شعراو هنگاوی بو پیشکوتن وبرا وورد یکی
تاریخی فقیرترنابیت وبیوەژنی زوت ... ناشارتیەوە بلێم سف اقرار اکم کە نشریاتی
سبیی پیشکوتنە بو وطن وملت بلام لە درجەی صدهما ٩٩ مادە واجب ترهە یە یا
ام نشریاتە نم دی کە لە پشتە کەی بنووسیت مجانی = خورای وکو مرحوم فیلسوف نرمو
اینیحمە رزی آن ست کە زر منیوا هد لە گل نشریاتیکی تازە درا چیت بە رلوا بو نشینە
بە رگە کەی اروانم بزانم لە اقتدارما هیە بیکرم دوبارە رجا اکم لە هەمو لاوان
کە لە سال دا (٣ روژەی شینی پاشی کوتنی) لە وختیکی معلومە دا لە تواوی نقاطی
کوردستاناتە دا بە دستوری لیشەوە عرض مقام آن کرا بی کتە تا ام ملتە قور
بە سرە توزی بیعو ریتەوە ایتر بە خزاتان اسپیرم

## پەراوێزەکان:ـ

١ ـ دیوانی قانیع ـ شاعیری چەوساوەکانی کوردستان ـ بورهان قانیع چاپی یەکەم ـ چاپخانەی زانکۆی سلەیمانی ١٩٧٩ ز.

٢ ـ ئەمە نیشانەیە بۆ ئەوەی کە لە تەمەنی: ٤٠ ڕۆژەدا بوە باوکی مردوە ولە پێرەوکەییدا دایکی و....هتد بڕوانە، ل/ (٥)ی سەر چاوەی پێشوو.

٣ ـ دیوانی نالی ـ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمو کوڕانی ـ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کوردی ـ بەغدا: ١٩٧٦ز. ل/ ٣٧٠.

٤ ـ چیم دی ـ ئەحمەد خواجە ـ چاپخانەی شەفیق بەغدا/ ١٩٦٥ز ل/ ٩٥ ـ ١٠٤.

٥ ـ لە کەشکۆڵی یەکەمدا لە جێی (پەیدام نوسراوە: (مینا)ء(یەثریب) شاری مەدینەو (بەطحا) مەککە یە کە هەر دوو پیرۆزن لای ئیسلام.

٦ ـ لە سەرچاوەی یەکەمدا لە جێی (بە قوللابی موژەی ئەو نوسراوە (بە حەلقەی زولفەکانت).

٧ ـ ئەم تاکە لە سەرچاوەی یەکەمدا نیە. (تانە) شارێکی هندستانە کە (شێخ) تیا بەند بوو، (مەحاق) مانگی یەکشەوەیە کە نەبیزێت. (عەینی) بەواتە چەشنیو (چاو) یش ئەگرێتەوە. (پێ تەختی سولەمان) مەبەس لە (شاری سلەیمانی) یە و دیاردەیە بۆ (حەزرەتی سولەیمان) کەبە (شێخ مەحموود)ی پێ چواندوە. جوانی وێژەیی لەم تاکەدا زۆرە. و بەم تاکەوە هەڵبەستەکە بۆتە (٧) تاك کە پێشان ئەبوایە ژمارەی تاك (بەیت) تاك بێ لە پیرۆزی خواوە کە تاکە.

٨ ـ (لەیلەتولئەسرا) دیاردویە بۆ ئایەتی ١ سوورەتی (ئەسری) لە قورئاندا:ـ (سُبحان الذي أسرى بِعبدِه ليلاً من المَسجِد الحرامِ الى المسجد الأقصى) لە مەڕ چوونە میعراجی پێغەمبەرەوە کە (قانیع) هاتنەوەکەی شێخی، بە (میعراج) چواندوەو (ئەسری) بەوانە (دیل)ەکانیشە هەر مەبەس لە شێخو دەستەکەیەتی.

٩ ـ لە سەرچاوەی یەکەمدا لە جێی (هەڵ نەکەند) نوسراوە (هەڵ نەهات) وتیا شیا نوسراوە (نوسخە ـ هەڵنەکەند) واتا لەنوسخەیەکی تردا (هەڵنەکەند) بوو وەك لەم سەرچاوەی دوەمەدایە.

لە سەرچاوەی یەکەمدا لە جێگەی (دەشتی سنگی بازیانم) نوسراوە (دەشتی سینەم خۆش نوما). ئەم تاکە لە سەرچاوەی یەکەمدا پێنجەمینە.

١٠ ـ ئەم تاکە لە سەرچاوەی یەکەمدا شەشەمینە لە هەردوو سەرچاوەکەشدا دوا تاکە. لە سەرچاوەی یەکەمدا لە جێی (بازاریا فەلەك مەحموودو خەزنەی) نوسراوە: (بازار حەبیبی یار عیشوە)و لە (مەحموود) و (خەزنە) سولتان مەحموودی غەزنەویی کەشاری (خەزنە) پایتەختی بوە مەبەستە وەك شێخ مەحمودو پایتەختی خەزێنەی لە (سلەیمانی) بوەو هەردوو مەحموود وەك (جەم) پادشا بوون: (قوم فەئەنذر) دیاردەی ئایەتی ١ی سوورەتی (المدثر)ی قورئانە: (یاایها المدثر قُم فأنذر) کە فەرمانی خوایە بۆ پێغەمبەر تا مژدەی پەیا بوونی ئیسلام بدات وەك (قانع)یش مژدەی پەیا بوونەوەی شێخی داوە..

له سەرچاوەی یەکەمدا لە جێی (جژنی) و ووشەی (دەردی) نووسراوە.
من کە لە نزیکەوە شارە زاییم لە وەستایی و، ووردەکاری (قانیع)دا هەیە، بۆیە هەر چەندە لە هەردوو کەشکۆڵە سەرچاوەیشدا شتێك لە سەر ئەم دوا تاکی هەڵبەستە نە نوسراوە، بەڵام هەر بە سەر زارەکی بە سەریا تێنەپەڕیمو، سەرنجی قووڵ ترم لێ گرت، هەتا توانیم ئەوە ساغ بکەمەوە کە ئەم تاکەی دوایی وەك لە جێگەی خۆیدا واتای جوانی خۆی ئەگەیەنێت، لە هەمان کاتیشدا پیتەکانی (جژنی) و (قم فانۆ ر) بە ژمارەی (ئەبجەدی) کە: (ج = ٣ + ز «ژ» = ٧ + ن = ٥٠ + ی = ١٠) لەگەڵ (ق = ١٠٠ + م = ٤٠ + ف = ٨٠ + أ = ١ + ن = ٥٠ + ۆ = ٧٠٠ + ر = ٢٠٠) ئەکەنە: ١٢٤١ وە ئەمیش ژمارەی ئەو ساڵی کۆچی (هیجری) یەیە و بەرامبەرە بە ساڵی ١٩٢٢ ز. کە شێخی مەزنمان لە دیلی ئینگلیزەکانەوە بە پاشایەتی گەڕاوەتەوە (سلەیمانی) کە لە تاکی چوارەمدا بە (پایتەخت) ناوی بردوە، ئەمەش بەڵگەیەکی تری ڕاستی بۆچوونەکەمە لە مەڕ بۆنەی هەڵبەستەکەو توانایی (قانیع)ەوە.
١١ ـ ئەم ساخ کردنەوەیەم بەپێی دەستوورەکانی: (التقويمان الهجـري والميلادي ـ جی ئێس. پی. فريمان جرنفيل ـ گۆرینی ـ د. حسام محي الدين ئالووسی چاپخانەی جەمهووری/ بەغدا/ ١٩٧٠ز. کردوە.
١٢ ـ دووربا = دووربێ، جە = لە. ماچان = ئەڵێن.
١٣ ـ شنەفتەم = بیستم، بیستووە. چەم = چاو. داری هەتە. بە داخەوە ئەم (فروفروانە) یەم بۆ ساخ نەکرایەوە.
١٤ ـ باز = دیسان، وە مەبەستیش لە مەلی بازو ئەفسانەی پیرۆزیـەکەیـەتی. شانـا = هەڵیدا، فڕێیدا. مۆری نەرد = مۆری یاری دامە یا تاوڵەیە، وە سەد = بە صەد (سەد).

١٥ ـ نەو ڕەس = تازە پێگەیشتوو، نوێی ڕەخساو نەوهال. = نوێی هەڵچوو.
١٦ ـ نیو باڵی یەکەم لە مەڕ ڕواڵەتی لیهاتوویی بازی چاکی مەشق کردووەوەیە.
١٧ ـ جەیران = ئاسك. ڕەوییە = ڕەو کردوو.
١٨ ـ کەبك = کەو، قەهقەهە: بەواتە قاقای پێکەنیە بەڵام لێرەدا مەبەست لە قاسپە قاسپی کەوە. تەر = مەبەس لە نوینی، تازەیە.
١٩ ـ نەداش = نەیدا.
٢٠ ـ خەس = درك، ستری.
٢١ ـ هوون = خوێن.
٢٢ ـ نەکێشۆ = نەکێشێ، نەبات. نەنیشۆ = دانەنیشێ چەنیش = لای ئەو، لەوەوە.
٢٣ ـ پێم سەیرە کە لێرەدا ووشەی (نەکا = نەکات)ی بەکار هێناوە کـە بە هـەورامیانـە (مەکەرۆ)یە، دیارە لەبەر کێشی هەڵبەستەکە وای ووتوە یا دەسکاریە. لەبان = لەسەر، لێوان، نەگیرۆ = نەگرێت، وەرنەگرێت.
٢٤ ـ مەجنوون ولەیلا مەبەستی شۆری ئەم جووتە دڵخوازو دڵدارە عارەبە یە.
٢٥ و ٢٦ ـ لەم دوو تاکەدا مەبەسی فریودانی باوە (ئادەم)، لە لایەن دایکە (حەووا) وە بۆ بێ

فرمانی خواو خواردنی گەنم کە: خوا لە بەهەشت، دەریکردن و خراپەو شەرمەسارییان بە سەراهات. (یاوبا) م بۆ ساخ نەکرایەوە .

٢٧ - دیاردەیە بۆ داستانەکەی (لووط) و جیا بوونەوەی لە خوا نەناسەکان و هەڵگەڕانەوەو دڵ لا بوونی ژنەکەی بۆ ئەو خوا نەناسانە کە خوا ئەویشی وەك خوا نەناسەکان لەناودا. و بوە مایەی دڵگرانی لووط.

٢٨ - مەبەست لە داستانی بە ناونگی شیرین و فەرهادە...

٢٩ - دیاردەیە بۆ سۆفیەکی وەك شێخی سەنعان کە ژنێکی خراپ فریوی داو دڵی پاکی پێ گۆڕی...

(هارووت) و (مارووت) جوتێ جادووگەرن کە بە هۆی فریودانی ژنێکی جوانی ڕەوشت خراپەوە سزاوارو لە نەفرینی خوا دان لە بابل.

٣٠ - (هابیل) و (قابل) کە برا بوون و هەردو کوڕی (ئادەم) بوون بەکەمیان براکەی خۆی لە سەر حەزلێکردن و ئارەزووی مارەکردنی خوشکی نەویکەیان (براکەی خوی) لە سەر ئەوە کوشت.

بەداخەوە لە قاوی (بەلعەم) وێی نەکەوتم چ باسە).

نیەن = نبە. پەرێ = بوتێ، لەبەرتۆ..

٣١ - دیارە هەر کە باسەکەی لە ڕادیۆ بیستوە کوتووپڕ هەڵبەستەکەی داناوە.

٣٢ - مەبەس لە خراپی ڕژێمی (ڕەضا خان)ە کە ئیستیعماری ئەنگلۆ ئەمریکیا دوای جەنگی دوەمی جیهانی لە گەڵ (رووس) دا ئێرانیان داگیر کردو ئەو پادشایەیان لابرد.

٣٣ - مەبەستی دامەزراندنی یەکەم فەرمانڕەوایی (فارس)ە لە ئێراندا لە سەر دارو پەردووی (ماد)یە کوردەکان کە لەوساوە فەر مانڕەوایانی (فارس) دوشهنی گەلانی ئیرانن.

٣٤ - (خووگ) بەرازی خرتە و مەبەستی (ڕەضا شا) یە. کە پێش‌بینی یەکەی (قانیع) هاتەدیی کە (حەمە ڕەضا) ی کوڕیشی ڕووخا.

٣٥ - بەداخەوە ئەم ئاواتەی (قانیع) نەهاتە دیی کە ڕووخانی (حەمە ڕەضا) یش ببینێ، بەلام گەلی کوردی ئێرانن ئاواتە کەیان هێناوەتە دیی. هەرچەند لە جێگەی ئەو (خومەینی)ی چەپەل بە چەکە بوگەنە ترۆکراوەکەیەوە کە (ناوی ئایینی) بە درۆیە هێشتا هەر کورد قەلاچۆ ئەکات و ناچێتە ژێر باری دان بە مافی گەلان دا نانەوە چونکە پەیڕەوی شایەکانی ئێران ئەکات کە (حەمە ڕەضا شا) یش لە پەیکاری پەیمانێکی بە (ناو) ئایینی دابوو لە پەنجاکانی ئەم چەرخەداو بۆ (خومەینی) بەجێ هێشت لەسەری بڕوات.

٣٦ - (تەل) مەبەستی پۆستە خانەیە، (ناوەندی گەناو) مەبەسی ناو دەریایە کە (ڕەضا خان) یان دوورخستەوە بۆ ناو (جزیرەی مۆریس) لە دەریا دا و لە وێ لە ١٩٤٤ ز. دا سەری نایەوە کە زۆلە کوردێك بوو.

# زەوی شوناسی

كەریم زەند

## لوڕستان ـ

ـ ۲ ـ

**٦ ـ ئیتیوەند :**

**تیرەی ئیتیوەند لە ناوو دوو مەڵبەندایە** ـ دوولیكان وگەناوەری ، لە خاوەرەوە میهراب كێو ، لە خۆرئاواوە ـ كاكەوەند ، باشووری سەركەشتی و بابای گەورە ، باكووری خاوەری ، میربەگ و نور ئەلی .

كشتوكاڵی ـ هەر گوندەی ئاوی خۆی هەیە بۆ كشتوكاڵ و ئاو خواردنەوە ، لە كێوی سەركەشتی گەچ و دارو خەڵوزی لێ پەیدا ئەكەن ، بەرهەمی دێمی و بەرئاویان هەیە بەرهەمی ئاژەڵیان زۆرە ، ڕێگەی باختەران و خورەمئاباد بە ناوەندی دوولیسكاندا ئەروات . كڕین و فرۆشتن لەتەك كرمانشاو هەرسین و گەنكاوەرو بەتایبەتی باتولیسەركان كە ٤٨ كم دوورە .

لەبەرامبەر گوندی چراخ ئاوا لەسەر لوتکەی ئەو کێوە ئەشکەوتێك هەیە ١٥ ـ٢٠ گەز درێژە .

مەلالە شاگوندی ئەو ناوچەیەیە لە ناوەندی دوولیسکاندایە ، هەر هەمووی ١٦ گوندە ، ١٥٣ خانەوادەیە گەنکاوەری ـ بەهۆی کانیاوی ساردو رووباری گیزو سەرچاوەی قوماش و پەری‌یەوە کشتوکاڵ دەکەن هەر گوندەی ئاوی خۆی هەیە ، کێوی سەرکەشتی گەچی هەیە ، بە کانی قەڵاسەنگ بەناوبانگە ، بەرهەمی نیوە دێمی و نیوە ئاوی‌یە ، ئاژەڵداری ئەکەن ، بە دوای لەوەردا ئەڕۆن بۆگەرمیان ، بازرگانیان لە تەك کرمانشاو هەرسینە ، سەخت‌ترین کێوی ـ سەرکەشتی و قەتگی پەری و کێوی بزکەنە ، ئەم مەڵبەندە ١٧ گوندە ، ٢٤٣ خانەوادەیە .

**٧ ـ ئەولاد قوباد ـ**

**خاوەری ـ تەنگی با ئاوەر**

**خۆر ئاوای ـ کاکەوەند**

**باشوری ـ کێوی گوڵ ئەندام**

**باکووری ـ گوندی سپی سەر بەناوچەی ئیتیوەند**

بە هۆی رووبارو کانیاوی ساردەوە کشتوکاڵ ئەکەن بە تایبەتی لە رووباری بائاوەرو سەرچاوەی زەردئالو ، سەرچاوەی کەبود ، کانی دەرویش ، کانی دناب و کولەوزو دڕەو رووباری یادگار ، کانی کەرەم خان ، سەرەرای ئەوە ، هەردێ‌یە ، کانیاوی خۆی هەیە ، لەکێوی کەشتی گەچ و دارو خەڵوز پەیدا دەکەن ، بەرەهمی نیوە ئاوی و نیوە دێمی‌یان هەیە ، ئاژەڵداری ئەکەن ، بە زستان بەرەو گەرمیانی وردزو تەرهان ئەڕۆن .

بەرهەمیان ـ گەنم و جۆ ، گەنمە شامی ، بیستان و کڕین و فرۆختیان لە تەك نەهاوەندو نویسەرەکانە ، باشترین دیهاتیان وەنابە لە ناوەندی ئەم مەڵبەندەدا کە ٢٣ گوندەو ١٧٤ خانەوادەیە .

٨ ـ **کاکەوەند** ـ شەش تیرەن ـ غەیبی غولام ، ئەلی ئەلیها ، دڵەوەند ، تاج‌وەند ، موزەفەر وەند ، باریکەوەند . خاوەری ئیتوەند ، خۆرئاوای ـ هەرمین ، باکووری ـ خاکی خه زه ل ، باشووری ـ کێوی سەر کەشتی‌و سپی .

بە هۆی کانیاوی ساردو دووریزە رووبارەوە زەوی‌وزار ئاو دێر ئەکەن ، بە تایبەتی لە رووباری تۆکە چەند لکێکی هەیەو بە رووباری کینی کۆتایی دێت ، لە ناو ئەولاد ـ کورانی قوبادا رووباری باریکەوەوەند سەرەرای ئەوە کە هەر گوندە ئاوی خۆیان هەیە . بەرهەمیان چواریەکی ئاوی‌و سێ‌یەکی دێمی‌یە ، لە بەرهەمەکانیان دانەوێڵەو بیستانە . ئاژەڵداری ئەکەن ١٥٠ سەر مەرێکیان هەیە . رێگەی کرمنشا لە گوندی سپی تیرەی ئەلی ئەلیها بە رووباری تۆ لە ئیتوەندەوە تێدەپەرێت ، بەرەو خورەم‌ئاوا رێگەکە ئەروات ، لە تەك هەرسین‌و کرمانشاو گەنکاوەردا بازرگانیان هەیە .

سەخت‌ترین کێوەکانی لە ناو غەیبی غولامدا ، جێگەی دزان‌و نوکەو گڵدزە لە نێوانی هەرسین‌و غەیبی غولامدایە .

هەموو کاکەوەند ١٠٨ گوندە ، ١١٣٥ خانەوادەیە .

## ٤ ـ چیگنی:

بە ناوی تیرەی چیگنی‌یەوە ناو نراوە لە نێوانی سپی کیوو رووباری خورەم ئابادو دروئابادایە .

سنووری :

باکووری ـ کێوی‌سپی تا تەنگی تیر درێژ ئەبێتەوە خاوەری ـ رووباری خورەم ئاباد بە کێو کۆتایی دێت .

باتیری ـ کێوی مەپل ، کراز تاکو تەنگی تیر باشووری ـ ڕێگەی شوسەو ڕووباری خورەم ئاباد ئەندازەی فراوانی زەوی‌یەکەی ( ١٥٠ ) فرسەنگێ . بەرزایی‌یەکانی ـ لەمەڵبەندی چیگنی‌دا کێوی سپی‌و یاقتەو کێوەرەش‌و مەپل ، وەراز ، کێوی ئافتاو ، کێوی زلکلول کە حەوت زنجیرەن و بریتین لە :

أ ـ کێوی سپی ـ لە باشووری خورەم ئابادەوە لە تەنگی گاوژمار ، ریزە چیای بوومی کۆتایی دێت ، لە تەنگی تیر لکی لێ ئەبێتەوە بەرانبەر زەردەلان کۆتایی دێت ، کێوە سپی ٤٢ کم درێژەولکەکەی ٣٦ کم ئەبێت . ئەم کێوە چەند گوزەرگەیەکی هەیە وەکو :

أ ـ هەروەر لە ملەوە تا رەبات ٣ کم ئەبێت بە سواری .

ب ـ خرپسوار ـ لەکیچەوە بۆ گەردنی کێوەکە ، ڕاستەوخۆ بەرەو بەستام ، پیادە ڕێگەیە ، زستان‌و بەهار بەفر دای ئەپۆشێت ، هاتوو چۆی سەختە ، لەملەی شەتەو تلوار زستانان هاتووچۆ ئەکەن .

کێوی سپی بەردەڵانیو جەنگەڵە ، لوتکەی بەرزی لەنێوانی خرپسوارو ساردآوا بە کریوی ناو ئەبرێت .

٢ ـ کێوی یافتە ـ بەرزو گرنگە لە نزیکی کلکەی کێوی سپی‌یە بەردەڵانییە ، لە بابەعەباسی کشتوکاڵی لێ‌دەکرێت .

٣ ـ کێوەرەش ـ لە کلکەی کێوی سپی بەو نزیکی تەنگی گاوژمارە ، کێوێکی گڵی‌یە ، ڕووباری توشکان لای خۆرئاواوەیەتی .

٤ ـ کێوی ئافتاو ـ لە زنجیرەی کێوی سپی‌یە ١٢ کم دوورەو ١٢ کم درێژە ، نزمو نەوی‌یە لە تەپۆڵکە ئەچێت ، ئاودارە ، خێڵی دولایی لە تەنیشتی ئەم کێوەن .

٥ ـ کێوی مەپل ـ ریزە کێـویکی بەرزە ، دریـژی ١٢ کم ئەبێت . بەردەڵانییە ، لوتکەی بەرزی هەیە ، دامینەکانی جەنگەڵە ، داری هەنارو ترشی هەیە .

٦ ـ **کێوی وەراز** ـ بەرزترین‌و درێژترینی کێوی ئەم ناوچـەیەیـە ٦٠کم دریـژە لە تەنگی تیـرەوە رێگەی لورستـان ئەبـڕی ، بەردەڵانیـو جەنگەلە ، بە زستان لە هەموو جێگەیەکی‌یەوە هاتوو چۆ ناکرێت .

لە گوزەرگەکانی ـ داردارین ، زۆرباش نییە ، سوارەرێ ئەچێ بۆ ئەولاد ـ کوڕانی قوباد .

سوسەن ـ سوارەرێیە بۆ ئەولاد قوباد !

خینان ـ بەرزە پیادە رێیە ئەروا بۆ سەردەم لەکی .

گل‌گواە ـ پیادەرێیە بۆ کێو دەشت ئەروات .

داود رەش‌کراز ـ بۆ کۆ دەشت ، سوارەرێیە ، مام ناوەندی‌یە .

چنار ـ بۆ چنارو ئاوتاق ئەروا ، سوارەرێیە .

تاف ـ بۆ ئاوتاف ئەروا ، زۆرباشەو ئاسانە ، سوارەرێگەیە .

٧ ـ **کێوی زەنگلول** ـ نەوی‌یـە لە باکـووری خاوەریـەوە لوتکەی سەخت‌و نەوێیـە ، رووباری تـوشکان بـە تەنیشتیـدا ئەخشێت ، کـە ئەگاتەوە بە رووباری خورەم ئـاباد ، تـەپوڵکـەیەکی بـەرز لە ناوەنـدی رووباری توشکان‌و خورەم ئابادا هەیە ، بە کێوی ئاسنگەران ناسراوە ، بەرانبەری ئەم ریزە کێوانە ، ریزی تەپوڵکەیە لە سەریـەك تا دەشتـایی کشاوە .

رووبارەکانی ـ زەوی‌یەکەی ئاودارە ، یەك دوو خێڵی نەبێت هـەر هەمووی ئاویان هەیە ، رووباری خورەم ئاباد پێیدا تێدەپەرێت لە کەناری یافتە بۆ شوراب‌و دەشتی چیگنی بە کەناری تەپوڵکەی ئاسنگەراندا لە تەك رووباری توشکان ئەبن بە یەك ، قووڵی نیو مەترە ، رووباری توشکەن لە

تەنگی گاوژمارەوە لە دامینیکێوی مەپلو تەنیشتی ئاسنگەران تێدەپەڕێت لە تەك رووباری خورەم ئابادا ئەبن بە یەك ، دارستــان بە هــەردوولای رووبارەکەدا هەیە .

ڕێگەکانی ـ ڕێگەی شۆسەکراو لە خورەم ئابــادەوە بۆ ســەرئاوی جەنگانیو نــاوکەش ، ســەرئاوی دووریٚ ، تــوشکەن ، لە نــزیکیپردی شاپوری کۆن کۆتایی دێت . لە گەردنەی خاکدانەو ئاوتافەوە بۆ تەرهانو کێوی دەشت ئەروات ، ئەو پردە شوێنەواری مێژوویی یە . هەموو چیگنی ١١٨ گوندە ، موناتی ١٢ هەزار کەسە ، ٢٢٣٢ خانەوادەیە .

ئابوری ـ دانــەویلەو برنــجو گەنمــەشامی یــە ، بازرگــانی لە تەك خورەم ئاباد‌و شارەکانی تردا هەیە ، بە تایبەتی ، خوریو رۆنو کەشك ، کە بەرهەمی سەرەکی ئەم مەڵبەندەیە ، لەوەرگای ، لە تەنگی گاوژمارو کــەناری رووبــاری کەشکــانو دامینی کێــوی بــابــەعــەبــاس‌دا هــەیــە ٢٠٠ ـ ٣٠٠ سەر مەری تێدا ئەلەوڕێت ، هەموو مەڵبەندەکە دارستانەو جەنگەڵە ، بەهۆی بڕینی دارەکانیەوە ، کەم بۆتەوەو بەرەو نەمان ئەچێ .

لە کانەکانی ، کانی گەچ لە ژێر تەنگ‌تیرو سەربرە .

پردەکانی ـ پردی کەشکان لە بەر ئافتاو ، پردی کەڵور لە مێشگر .

## ٥ ـ سەگەوەند :

کەوتۆتە خاوەری لورستانەوە

سنووری :

باکووری ـ کێوی بلومانو نمەکدان

خاوەری ـ ریزە کێوی سەرنجەو گەردنگای کنگرزەردو مەڵبەنــدی هەنام کریت .

بــاشووری ـ کێــوی سیەمــەرەو جیگای کــاکەشــەرەفو گەردنی ساڵیڕێگەو گردی گەناو .

باتیری ـ کێوی بەردەسپی ، شەقامی کەماسوند ، ئیمـام زادە ، مادکەهی ئەهمەد ، گەردنی گلنكزەن

رووبەری زەوییەکەی ـ ٢٧٧ کم٢

( خێڵەکانی خاوەن سەگن ، بۆیە بەم ناوەوە ناسراون )

کێوەکانی ـ چوار ریزە وەکو ـ مەخمەڵو دامینی سیاکەمە ، کێوێکی بەردەلانییە ، لە باکووری ئەزنایە .

**٢ ـ ریزە کێوی کنگرزەرد ـ کێو سەرنجە ، بەردەلانیو جەنگەڵە لە باکووری ئەزناوە .**

**٣ ـ کێوی سێ کڵاوە ـ ٣ لوتکە بەردە وەکوو کڵاو ، جەنگەڵی هەیە ، لە باکووری موهملەوە .**

**٤ ـ کێـوی ئەزکـەنە ـ لای خـاوەری کیانـەوە ، هـەمـووی بەرانبەری یەکن .**

**ریگاوبانی ـ**

١ ـ رێگەی قەلاتەجرە ـ دوژی هوسین خانی ساکی تاکوکەیان درێژ بۆتەوە .

٢ ـ دێدانکی ـ گەردنی کێوی بابە مەحمود ـ مەڵبەندی موهمیل .

٣ ـ رێگەی کەیان ـ موهمیل ـ ئەزنا .

٤ ـ رێگەی ئەزنا ـ گەردنی بابەخانی ـ کەماڵەوەند ـ کرکا .

٥ ـ ئەزنا ـ گەردنی ساڵەرێ ـ کاکەشەرەف .

٦ ـ موهمیل ـ ئەزنا .

٧ ـ سەی زیبا ـ گریت پاپی .

رێگە سەختەکانی سەگەوەند ـ ئەمانەیە ـ

١ ـ کەیان ـ تەنگیزیبا ـ موهمیل .

٢ ـ کنگرزەرد ـ ئەزنا ـ نرسی ـ گریت

٣ ـ موهمیل ـ گەردنی ٣ کڵاو ـ ئابستان

٤ ـ گەردنی دارسپی بۆ گوندی گەورەی ئابستان لە موهمیلەوە

٥ ـ کەیان ـ کێوی ئەزکەنە ـ سنووری سیلاخور

رووبارەکانی ـ رووباری بچووکی ئابستان لە قەلەکەدینەوە گوندی سپی کەڵکی لێ وەرئەگرن ، دوای ئەوی ئەرژێتە بچووك تەنگ زاهید شیرەوە .

رووباری کەیان لە سەر ئاوی تەویلەو سەرئاوی شاو سەرئاوی سیرکە لە دامینی کێوی چاڵەوە دێتەدەر ، مەڵبەندی موهمیل ، ئەزنا ، سەیزیبائاو دێر ئەکات ، ئەچێتە ناو کاکەشەرەف بە کرکا تێدەپەرێت ، ئەرژێتە رووباری خورەم ئابادەوە .

بەشەکانی سەگەوەند :

## أ ـ ئابستان :

باکووری ـ کیو بلومان و ریزە کیوی تمەکدانی هەڕو

خاوەری ـ کێوی تەجرەو میل‌میلك ، تەنگی زاهد شیر .

باشووری ـ کیوی دارسپی ، بابەمەحمودو ئەنجیرك .

باتیری ـ کێوی زەردلیەو تەکەو ملەی تکە .

کشتوکاڵی ـ دنەویڵەو لوبیاو ماش و سەوزەو بیستانە

بازرگانی ـ خوری و رۆن و کەشك و مەڕ ئەبەن بۆ خورەم ئابادو بروجردد ، کرین و فروختیان هەیە لە تەکیانداو ئاژاڵداری ئەکەن ، زستانان ئەچن بۆ گەرمیان ، ئەم مەڵبەندە ( ١٤ ) گوندە ( ١٩٥ ) خانەوادەیە .

### ب ـ کەیان :

باکووری ـ ریزە کیوی زەردەلییە ، چاڵکیو ، ملەی شاپەسەندە .
خاوەری ـ کێوی ئەزکەنە ـ رێگەی مەیان راکان ـ گەردنی پلە
باشووری ـ یاسین تەپە ، لکەی بەرکورد ، ریزەکێوی ئەزکەنە
باتیری ـ گردەکانی ئابستان و ریزە کێوی دارسپی .
ئەم مەڵبەندە ، شیوو دەرەی فراوانی تێدایە ، رووبارێکی بچووکی تێدایە ، لە سەر ئاوی تەویلەو سەرئاوی شاوە دێتە خوارەوە ، کانیاوی زۆری هەیە وەکوو ـ سیرك لە دامین زەردەلی .
خاوەری کەیان ، تەپۆلکەی خاکییە ، بە قەلآ کەلاوەی گەبر بە ناوبانگە ، گۆرستانی گەبرەکان لە نزیکی یەوەیە .
کشتوکاڵی ـ دانەویلەو گەنمەشامی ، نیسك ، ماش ، لوبیا ، نۆك و کاڵەك و شووتی یە .
ئەم مەڵبەندە، ٦ گوندە ، ٥٨ خانەوادەیە

### جـ ـ موهمیل :

لە باکوورەوە ٣ کلآو ، کێوی جك‌لقی ، سیاکەمەر
خاوەری ـ تەنگی ئەزنا ، کێوی چك بەلکیس .
باشووری ـ کێوی خەرسیا ، گەردنی گریت
باتیری ـ تەنگی کەیان ، ریزە کێوی خەرسیاو دارای سپی
کشتوکاڵی ـ دانەویڵە ، ماش وەکوو مەڵبەندی کەیان وایە ـ کڕین و فروخت لە تەك خورەم ئابادو بروجردا دەکەن .
هەمووی ٦ گوند ، ٥٨ خانەوادەیە .

د ـ ئەزنا ـ

باکووری ـ کێوی مەخمەڵ ، سیاکەمەر ، بابەمەحمود ، چكتەقی

خاوەرێ ـ کێوی میدمران ، تەنگی تاریكدەرە ، کیوی سەرنجە .

باشووری ـ گەردنی بابە خانی ـ گەردنی کلنکان ، کاکە شەرەف

باتیری ـ ڕێگەی کەماڵەوەند ، ریزە کیوی بابە مەحمود گەردن کەرەرێ .

لە هەموو مەڵبەندەکانی سەگەوەند مەزنترە ، لە دەشتایییەکی گەورەدایە ، رووبارێکی بچووکی پێدا ئەروات ، چاوگی لەکەیانە ، سەیزیباو موهمیل ئاودێر ئەکات بەرەو ئەزنا ئەروات ، دوای تەنگی سەیمەرو ، ئەچێتە کاکە شەرەف ( پاپی ) ، هەموو جۆرە کشتوکاڵی تێدا دەکرێت .

یادگاری مێژوویی تێدایە ، لە گۆزەو تەشتو گڵینە کە هێشتا هەڵنەکراوە ، هەمووی ٨ گوندە ، ٥٣٤ خانەوادەیە .

## ٦ ـ خورەم ئاوای فەیلی :

باکووری ـ کێوی سیاکەمەرەو تەنگی رەبات

خاوەری ـ گرکانەو کێوی مدبەو رووباری خورەم ئاباد

باتیری ـ کێوی سپی

باشووری ـ کێوی مدبەو کوردگا .

خورەم ئاباد دەشتێکە پانی ٣ کمو درێژی ١٠ کم ، کیۆ ئابلۆقەی داوە ، لە پێشا بە خایدر ـ خایداو ناسرابوو لە سەردەمی عیلامیدا .

ئێستاش یادگاری مێژوویی ماوە لە نزیکی رۆشنگەی خورەم ئاباد لە

شارە کۆنەکە بەرانبەری پردو ئاشی ئاوەکان ، بەڵگەی بوونی کشتوکاڵی چەرخە دێرینەکان .

کەلاوەکانی شاپور ، شوێنەوارن ، رۆشنگەکە لە سەردەمی ئیسلامدا دروست کراوە ، جەنگی تێدا رووداوە لە چەرخی ئەتابگان وێرانبووە ، دوژی فەلەك ئەفلاك ـ قەلای سپی تێدایە ، سەرچاوە ئاوی زۆری هەیە وەکوو ـ

گردئاو ، ئاوی‌ناسری ، لە رووباری خورەم ئاوا لە پاپی‌خاڵدارجوێ ئەبێتەوە بە دامینی کیوەکە تێدەپەرێت .

ئاوی گولستان لای سەربازخانەی پیادەوە یە ، ئاوەکەی زۆرە ، هەمێشە ناوبڕی ، سەرئاوی شائابادو سەرئاوی کیوئاوە .

بە هۆی لافاوی رووباری خورەم ئاواوە لە کاتی ئاوهەڵساندا چاڵو شوێنە ئەوی‌یەکانی بەروپشتی ئاوی تێدا ئەمێنیتەوە ئەبێتە هۆی پەیدابوونی مێشوولەی ئەنوفلس ، هێلکەی تێدا ئەکاو ئەتروکێ‌و لەرزوتا بلاو ئەبێتەوە .

## ٧ ـ کەرکا

باکووری ـ خورەم ئاواو خاکی کەماڵەوەند

خاوەری ـ خاك پاپی

باشووری ـ شۆراب و بالاکریو

باتیری ـ خاکی چیگنی

رووپەری ٦٠ کم[٢] ، زەوی‌یەکەی بەپیتە ، دەشتایی‌یەکەی بەم بەرزایی‌یانە ئابلۆقە دراوە ـ

سپیکێو ، کێوی وەران ، یافتە ، ملەی مدبە ، ریزەتەپۆلکەی سپیدەشت ، کێوی شەهنشا ، کێوی تاف ، کێوی نەژوومان لە باشوورو باشووری خاوەرەوە .

دوو ئەشکەوتی هەیە ، بەکەمیان لە کێوی مدبە ، ئەوی تر لە کێوی ورانە .

رووباری - رووباری خورەم ئاوا بە بەشی باکووری ئەم دەشتەوا ئەروات ، لە باشووری باتیری کەرکا ئەچێتە خاکی چیگنییەوە ، دوای ئەوە ی زەوی بەشی کرکا ئاودێر ئەکات .

رووباری وشك - بەدرئاوا - لە کێوی تافەوە بۆ بەشی باتیری کرگا دێت ، لە خوارووی کرکاوە ئەرژێتە رووباری خورەم ئاواوە ، هەر بەهاران ئاوی هەیە .

چاوگەکانی - کانی شاهەنشا ، سەرئاوی باس ، کانی سالی کانی سورەدێ ، کانی سەرئاوی جنگائی ، کانی سەبور ، کانی تاف کانی سەرخەلیزە .

نۆکەندەکان - نۆکەندی دارائی ، نۆکەندی بەدرئاوا

ریگەکانی - ریگەی خورەم ئاوا - دزفول - ریگەی شاهەنشا - چەشمەك - بالاکریو - دزفول - سوارەریو پیادەریه . ریگەی ماسور بۆ خاکی پاپی ، سوارەریگەیە ، ماسور - چیگنی - تەرهان ، ریگەیەکی خۆشە ، سوارەریه ، هەموو کەرگا ۳۸ گوند ، ژمارەی خانووی ۷٥٨ ئەبێت .

کشتوکالی - هەموو جۆرە کشتوکالێکی هەیە ، بازرگان لە تەك خورەم ئاوادا هەیە .

## ٨ - پاپی -

شوێنی ـ کەوتۆتە خاوەری لورستانەوە

سنووری :

باکووری ـ کێوی یاسین ، گەردنی سەی زیبا ، کەف شتر ، کنگرزەرد ، تەنگیسەی مەردو بەردکورد .

خاوەری ـ رووباری سزار ، چەم شوکر ، تەنگیسیّبادە ، کێوی هەلاکدر .

باشووری ـ دەشتیلالە ، شازادە ئەحمەد ، چالکەدری ، کەرنامی ، کێوی تەختسیر ، چالسیر ، کێوی چالمیل ، کێوی ئاوتکان ،

باتیری ـ رێزەکێو تاف ، کرکا ، کێو بون ، هەشتاتەنیشتی ، مدبە چواررێ ، مادەرکیك ئەهمەد .

رووبەری ١٢٥٠ کم٢

کێوەکانی ـ تاف ، لازگیرە ، کەرپیلە ، تیلمەرو ، نوژیان ، یاوز ، تاکنان ، کولنك ، کلات ، هەلاکدر ، کرناس ، چالپو .

هەمووی بە دارستان داپوشراوە ، داریبەرو ، هەرمێ ، گوێژو کەوتی زۆرە .

رێگەکان :

١ ـ رێگەی خورەم ئاوا بە هێڵی ئاسنەوە بە ئیستگەی کیشوەرەوە بەستراوە ، بەخاکی پاپی ، کەرێگای لورستانە ، لە بەندەر شاپورەوە ـ ئەهواز ـ دزفول ـ خورەم ئاوا ، ئاراك ، قوم ، تەهران .

هەروەها رێیئاسنلە پشت کیوی کرناسەوە بە بەشخاوەری دەشتلالەدا تێدەپەڕێت .

٢ ـ رێگەی پیادەو سوارە ـ گەردنە ـ نۆیژیانە ـ کرکا .

٣ ـ پیادەرێ ـ ئەستریها ـ میربەهاری ، نیو فرسەنگی باشە ، ئەوی تری بۆ سوارە دژوارە .

٤ ـ رێگەی پیادەو سوارە ـ سیولە ، چلویەك فرسەنگی باشە ، ئەوی تری سەختە .

رووبارەکانی ـ رووباری ئەوتۆی نییە ، جۆگەی بچووکن ، لەوانە ـ

١ ـ چەمی گەیچنارگل ـ لە چنارگل هەڵئەقوڵێ ، مەڵبەندی کاك شەرەفو کرکا ئاودێر ئەکا ، ئەرژێتە رووباری خورەم ئاواوە .

٢ ـ چەمی کاکە شەرەف ـ لە دوولك پەیدابووە ، یەکەمیان لەچنار گڵەوە ، دوومیان لە ئەزناوە ـ سەرگەوەند ـ بە تەنگی سەیمەرودا ئەروات ، چەمی کاکە شەرەف پەیدا ئەبێت ، سنووری کاکە شەرەف ، ئاودێرئەکاو دێتە ناو کرگاوە ، ئەرژێتە رووباری خورەم ئابادەوە .

٣ ـ چەمی کربت ـ دوای مەڵبەندی کربت ، ئەچێتە سەرکانەو لیریائیو ئەستەریهاو میربەهاری ، جۆگەی لێ هەڵئەگرن ، پاشماوەی ئاوەکەی ئەرژێتە رووباری سزارەوە .

٤ ـ چەمی کیشوەر ـ لە دامینی کیوی تاف هەڵئەقولی ، ناوی چەمی دارکە ، پاپیکەبوو ناوچەی کیشوەر ئاودێرئەکاو ئەچێ بۆ جێگای چلو ئەرژێتە رووباری سزارەوە .

٥ ـ گەلی رووبارو چەمی تری هەیە وەکوو ـ سیرم ، لوری ، لوان . باخی پێ ئاوئەدەن و ئەرژێتە رووباری سزارەوە .

٦ ـ چەمی کرپناس ـ لە باکووری خاوەری کێوی کرپناس ، ئەرژێتە رووباری سزارەوە .

٧ ـ چەمی دمدم ـ لە گەرمیانی پاپی یەوە بەرەو تەنگی کز ، ئەرواتو ئەرژێتە رووباری سزارەوە .

٨ ـ چەمی بچووكی تری هەیە لە مەڵبەندی پاپی لە چاوگە ساردەكان پەیدا ئەبن ، ئەو مەڵبەندانە ، ئاودێر ئەكەن و هەموویان ئەرژێنە رووباری سزارەوە ، جگە لە چەمی چنارگڵ و كاكە شەرەف .

٩ ـ رووباری سزار ـ لە سنووری بەختیاری و لورستانەوە لە تەنگی بەحرینەوە تێدەپەرێت و ئەرژێتە رووباری كاروانەوە .

تیرەكانی ـ خوانینی مورادی ، یاقوب وەند ، مودهەنی ،ماڵریزی لیریائی ، كیشوەری .

هەموو پاپی ٦٨ گوندو ( ١٠ ) مەڵبەندو ، ٥٧٢ خانەوادەیە .

خوانینی ، گەلی تیرەیە وەكوو ـ موهەمەد ناسری ، هادی ، نەسیری ، زەهرە ، هەیدەرخانی ، موهەمەد ئەلی ، موهەمەد سادق ، موهەمەد جەفری .

یاقوب وەند ـ چەند تیرەیەكە وەكوو ـ مەلەك ئەلی ، شەلیارەوەند ، قاسم ئەلی .

مودهەنی ـ لە جەمالی و مەلا پێكهاتووە .

ماڵریزی ـ لە تورجاری ، كەرەمی ، دەرویش وەند ، كیمەدی ، پێكهاتووە .

لیریائی ـ لە خورشید ، ركی ، مەنجەری ، شورەئی ، پێكهاتووە .

## مەڵبەندەكانی ـ

١ ـ كریت ـ چنار ـ سەرئاوی تەویلە ـ ٢ گوندو ٢٤ خانەوادەیە .

٢ ـ چنارگڵ ـ نوێش ئاباد ، سەرچل ، نوشادە ، ٣ دێ و ١٢٢ خانووە .

٣ ـ ترسی ـ تاریكدر ، رەزا ئاوا ، هەنام ـ ٣ گوند ، ٣٦ خانووە .

٤ ـ کاکە شەرەف ـ ژێر قەلا ، دو دی کیو ، قەلا موهەمەد ناسر ـ ٣ گوند ، ٤٨ خانووە .

٥ ـ لیریائی ـ ١٤ گوند ، ٢٣٠ خانەوادەیە .

٦ ـ سەرکانە ـ ٤ گوند

٧ ـ شەبان ـ ٢٢ گوند

٨ ـ کیشوەر ـ ١٢ گوند ، ١٨٨ خانەوادەیە .

٩ ـ لرین ـ ٣ دێ ، ٢٩ خانووە .

١٠ ـ بن ریز ٢ دێ ، ٦٧ خانووە .

**ئابوری** ـ کشتوکاڵی کەمە ، زەوی‌یەکەی شاخاوی‌یە ، بە زۆری ئاژاڵ‌دارن ، دانەویڵەیان هەیە ، جەنگەڵەکان داری بەڕو ، هەرمێ ، کەوت ، گوێز ، هەنجیرو ، هەنار ، چناری‌هەیە .

لەوەرگاکانی ـ لە کێوی کڵاو ، تەرس ، کریت ، کاننك‌وشابازان ، کوهیران ، دەرەگەرم ، مازاومیشان ، تاف ، تو ، پایتی شابازان ، جێگەی کەتیرمان ، ئەمانە لەوەرگای ٢ ملیون گیانەوەرە .

بازرگانی ـ بە زۆری لە تەك خورەم ئاواو دزفول‌و بەختیاری ، کڕین و فروشتن‌یان هەیە ، خوری ، رۆن ، کەشك ، داروخەڵوز ئەبەن بۆ شارەکان .

کانەکانی ـ کانی قیر لە ساجیان ، خوێ ، لە شابان ، خەڵوزی بەرد لە کیشوەر ، گەچ لە گەرمیانی پاپی .

شوێنەواری مێژوویی ـ لە گردی قەلا تەنگ ، لە قەلا کۆنەکەی ، هی سەردەمی یەزدی گورد ، لە گەرمیانی پاپی ئادی دمدم ، شوێنەواری قەلا شیخ ، بەردو جارو خشتی ماوە .

## ٩ ـ تەرهان :

کەوتۆتە خۆرئاوای لورستانەوە .

باکوورو خۆرئاوای ـ رووباری سیەمەرە ، لە باشوورەوە رووباری کەشکان ، خاوەری کێوی کراز .

رووبەری ـ ١٢٠٠ کم٢ ، ریزە بەرزاییەکە ناوەراستەکەی دەشتاییە .

کێوەکانی ـ هەمووی بەرانبەری یەکترن ، هەشت ریزن ـ

١ ـ کێوی کراز ـ ٦٦ کم درێژە ، لە کەناری کەشکانەوە لە تەنیشتی تەنگی تیرەوە دەست پێئەکات ، لە کەناری سیەمەرە ، لە زەردەلان کۆتایی دێ ، ئەم ریزە کێوە لە هەر جێگایەکیدا ، شێوەی جیاوازە ، لە حەیاتی غەریبەوە تا گەردنی چنارە ، کێوی کراز چەند گوزەرگەریەکی هەیە وەکوو ـ گوزەرگەی گرانە، چنار ، داود رەش .

لە زۆرترینەجێگایدا هاتووچۆ ئەکرێت ، رێگەی ئەم مەلبەندەتا ٣٠ کمی باشە ، کێوەکانی خاکو تەپۆلکەیە لە بەرانبەری چنار تا کو کاکیزەو ئەولاد قوباد ، ریزە بانی پەیدا ئەکات ، نێوانی کێوەکەو ئەم زنجیرەیە ، بانێکە ٢ کم ئەبێ ، جێگایەکی پانە ، هاوین لە بەر بێ ئاوی خێڵەکان سوودی لێ نابینن .

ئەم کێوانە بەردەلانییەو جەنگەڵە ، بەرزایی کێوەکانی لە هەندێ جێگادا نزیکەی ٨٠٠ کم ئەبێ ، بە تایبەتی لە کێودەشت .

٢ ـ ریزی دووەم ـ لە خۆرئاوای کێوی کراز ، دەشتی ناوەندی تەرهان ، دوو ریزە کێو لە باکوورو باشوورەوە ، ئەم مەلبەندەیان ، ئابلوقە داوە . لە باکوورەوە سووردم لوڕی بە درێژی ٢٤ کم لە باشوور سووردمی لەکی ئەو دیو بە درێژی ٢٤ کم .

ئەم دووریزە کێوە هەندی جێگای بەردەلانی یەو هەندێکی تری خاکی یە ، جەنگەڵ دایپۆشیوە ، سووردمی لەکی پانترو گەورەترە ، دەشتایی و گوزەرگەیان تێدایە .

٣ - ریزە کێوی داراوا ، هیزەماباد - لە گەناری کەشکانەوە دەست پێ ئەکات بە فراوانی ، بەرەبەرە نەوی ئەبێ بە دەشتی کێوماهور کۆتایی دێ ، کە بەردەلانیو جەنگەلادی یە .

٤ - بەرزایی چولوهۆل - بەرزو بێ ئاوە ، لەم کێوانە پەیدابووە - کەلەم کەبوت ، بەرزو رووتەنە ، شوێنی راوو شکارە .

کێوی زەردسوارە ، بەردەلانیو بێ گوزەرگەیە . کێوی هورە ، بەردەلانیو جەنگەڵە .

**٥ - کێوی دەمشیران - وەندەلەڕە - بلوران ، هەموویان بەردەلانیو جەنگەلاویو بێ ئاوە ، تەنگی گەورەی هەیە ، ئەشکەوتی گەورەی تێدایە جێگای هەزار کەس ئەبێتەوە .**

٦ - **کێوی سماق** - سەرکەف ، بەردەلانیو جەنگەلاوی ویە ، کانیاوی هەیە ، کێوی باخ تەمەرخان - خاکیو نەویو ئاودارە ، کێوی خەیاران بەردەلانیو سەختە .

٧ - **کێوی خەروس دڕ** - بەرزو بەردەلانیو جەنگەڵیە ، کێوی سێوەندانە ، نەوی یە ، سێ لوتکەی هەیە ، کێوی ناژیتە بەردەلانیو ئەشکەوتی زۆری هەیە ، کێوی کور بەردەلانیو لەوڕگایە .

٨ - **کێوی ملە** - بەرزو بەردەلانیو ، ئەشکەوتی زۆرە ، کێوی ویزتها ، بەرزو جەنگەڵیە ، کێوی سەرکەچ ، نەویو خاکی یە ، کێوی وزکور ، بەرزو بەردەلانییە ، هەندی شوێنی دارو درەختی هەیە ، لە پانتایی ئەم زنجیرەیەوە ، ریزە گردولکەیەکی گەچی هەیە بە پانی ٦ کم ، رووباری سیەمەرە لە نیوانیانەوە ئەڕوا .

رووبارەکانی ـ رووباری وای نییە ، لە باکووری تەرهان نەبیّ کە رووباری سیەمەرە لە تەنگی تیرەوە تیدەپەریّت ، لە سنووری تەرهانەوە بە کەناری وەزکورا ئەخشیّ ، هیّلی سنووری تەرهان ئەکیّشی ، لە گاومیشان لە تەك رووباری کەشکان ئەبن بە یەك ، دوو مەتر قووڵە ، سوودی نییە ، رووباری کەشکان بە سنووری باشووری خۆرئاوای تەرهاندا ئەروا بیّ ئەوەی کەڵکی لیّ وەربگیریّت . لە ناو تەرهاندا هەندیّ جۆگەی کەم ئاو هەیە وەکوو ـ جۆگەی مادیان ، ئاوی سیاب ، ئاوی قەلاّی ئەستان . تەرهان ، خۆی بیّ ئاوە کشتوکاڵی دیّمیەو بەرئاوی زۆر کەمە .

ریگاوبانی ـ تەنها ریّگەیەکی هەیە لە چیگنی ، لە خاکی‌دانەوە تیّدەپەریّت بە دامینی خاکی کرازا بەرەو کیّو دەشت ، ئەگەر ریّگەی مەعمولان ، کیّو دەشت ـ کرماشا کە ( ١٨٠ ) فرسەنگە بکریّتەوە ، سوودی ئەبیّ بۆ بازرگانی ، تەنها پردیّکی ئەویّ لەسەر ئاوی کەشکان لە مەڵبەندی کەلّوڕ ، ئیتر هەمووی دەشتایی‌یە ، لە کیّودەشتەوە بۆ ئەولاد قوبادو کەناری رووباری سیامەرە ، لە سەر ئەم رووبارەش پردیّکی ئەویّ ، ئیتر تا سان‌روستەم دەشتایی‌یە ، ترومبیل تا کرماشا ئەروا ، ئەگەر تۆزی ریّگەکە چاك بکریّت .

ریّگەی دووەم ـ تەرهان ـ چەرداوڵ ، لە کیّودەشتەوە بەگەردنی ناڵەشکیّنەدا بۆ سەری تەرهان ، بە کەناری رووباری سیەمەرەدا ، ئەگاتەوە بەریّگەی چەرداوڵ . هەر هەمووی هاتووچۆی پیّدا دەکریّت ، جگە لە کیّوی وەراز کە سەختە .

هەموو تەرهان ٨٩ گوندە .

تیرەکانی ـ ساداتی شاموهەمەد ، ئاوینە وەند لە پشتی وەیسیان ، رەشنو ، ئاسنان‌گر لە کیّو دەشت ، ئەولاد قوباد لە کاگیرە ، ریکا ، موونی لە مادیان رووبار ، روومیاتی لە پشتی تەنگ هاڵە ، رەحمان لالەوەند ،

سەبات نوری ، ئەمرائی سوری ، میروەند سووری ، ئومەرای روستەم خان ، لە روشکان ، میشە وەند لە ئەمیرئان ، خوشنامە وەند لە کێو دەشت ، ئەبو وەفائی لە تەماشی ، مەکرمە لە شاراموهەمەد گەراوەندو کوشکی تەرهان لە ریسان ، کورانی لە ژێر تەنگ ، سوراب وەندو پازەوەند لە پران پەرویز ، زبودار لە چوڵ وهوڵ .

ئابوری ـ تەرهان گەورەترین بەشی لورستانەو لە هەموویان بێ ئاوترە ، تەنانەت بەشی خواردنەوەیان نییە ، بێ ئاوی و هێرشی کوللە ، ژیانی پێ تاڵ کردوون .

بەرهەمیان ـ دانەویلە ، توتن ، بەڕوو ، هەرمێ ، گوێز ، داری ئەرخەوان و کەوت ، چنارو توو ، زەیتون .

باخی میوەی پڕ لە هەنجیرو هەڵوژە لە تەنگ سیاب و پێ ئاستان ، قارچك و هەنگوین و لەوەڕگای باش پێنج سەد هەزار مەڕی تێدا ئەلەوەری .

بازرگانی ـ رۆن و خوری و کەشك و بەرهەمی تر لە رێگەی هەلیلانەوە ئەبەن بۆ کرماشا ـ باختەران .

کانەکانی ـ خەڵوزی بەرد لە ژێر تەنگی تیر لە شاموهەمەد ، دمسان ، ئەولاد قوباد ، کانی گەچ لە رووبارئاوا ـ شورابە ـ سەرکەن ـ چوڵ وهوڵ و تەنگکراز ، خوێ لە شوارابەو گۆگرد لە تەنگی ریسان ـ ئاوێنەوەند ، قیر لە ئەولاد قوباد ، کانی پیروزە لە کێش ماهور لە نێوانی شاموهەمەدو دەشتایی ، بەردی سەوزو بریسکەداری زۆرە ، مومیا لە کێوی ملە هەیە .

شوێنەواری مێژوویی :

١ ـ قەلای پای ئەستان سەلسال .

٢ ـ قەڵای بەردوچاڵاو لەسەر کێـوی ریسان ، بـە قەڵای فـەلەك ناو ئەبرێ ، کە ناوی سەرداری ئەو مەڵبەندە بووە .

٣ ـ دوو قەڵای کۆن بە قەڵای ساسانی ناوئەبرێ ، لە کێوی دادە گڵەیە .

٤ ـ باخی زاڵ شوێنەواری شارێکی کۆنە لە دەشت کێو .

٥ ـ لە سووردەمی لوڕو . کێو دەشت لە گردی دزگەران نیشانەی قەڵای کۆن هەیە .

٦ ـ لە جێگادزان ، گۆرستانێکی گەورە هەیە کێلەکـانی نووسینی مێخیو کوفی پێوەیە ، گۆزەو گڵینەو لەتە سواڵەتی شکاوی زۆری لێیە ، هەروەها لە گردی جێگائەهوانو لە سوردەمی لوڕی گۆرستانی کۆنی هەیەو لە شەش کەرەم نیشانەی قەڵاو دوژی کۆن هەیە .

٧ ـ لە سەر کێوی چناران خانوویەکی قـایمو سەختی لێکـراوە ، تاقەکانی ماون .

٨ ـ لە روومشکان ، نیشانەی شاری کۆنو کەلاوەکانی ماوە ، بە بەگەبربەند ناو ئەبرێت .

٩ ـ لە جێگایل لە ناو خێڵی سوراب وەند لە روومشکان ، جێگایەکی قووڵ ٧ ـ ٨ م ئەبێ ، تاقێکی تێدایە .

## هەلیلان :

دەشتێکی فراوانو بەپیتە بەملاو ئەولای رووباری سیەمەرەدا بە درێژی ١٢ کمو پانی ٦ کم لە باکوورەوە جەلالەوەند ، لە خاوەرەوە ئەولاد قوباد ، لە باشوورەوە گرانەوەندی تەرهان ، لە باتیرەوە چەرداوڵ خـاك پشتکو ئابلۆقەی داوە .

دوای کرماشا لە سان روستەم ، تەنگێکی بچووکە ، ڕێگـەی لای ڕاستی بـەرەو گردۆڵکـەی ئیمام زادەو ڕێگـەی لای چەپی بـە بەرزایی باکووردا تێدەپەڕێت و دێتە دەشتی هەلیلان .

ڕووبـاری سیەمـەرە لە خـاوەرەوە بـۆ بـاتـیر ئـەخشێ لە نـزیکی کەهروقەلای خرابە بەرەو باشوور بۆ خاکی تەرهان دێت .

لەبـەرزایی باشـووری هەلیـلان لە ئیمام زادە گـومـەزێکی سپی ئەبینی ، شازادە مـوهەمـەدە کوری ئیمـام موسـای کازمـە لە ناوەنـدی دەشتەکەدا ، گردێکی بچووك ۳۰ م بەرزە .

لە کەناری ڕووباری سیەمەرە دوو ڕیزە گردۆڵکە هەیە بـە درێژی ۲۰۰ م ، دەشتاییەکی ڕێك‌و چیمەنە ، هەرچەند باران بباری نابێ بە هۆی ناخۆشی ڕیگاکە .

ماوەی نێوانی گردۆڵکەکانی باشوور تا ڕووبـار یەك کیلومـەترە ، ماوەی گردەکانی باکوور ٥ کم .

کشتوکاڵی ـ زەوی هەلیلان سێسەد جووتی تێدا ئەگەڕێ بەرهەمی دانەویلە ، گەنمەشامی ، لوبیا ، ماش .

خێڵەکانی ـ باڵاوەند ، زەردەلائی ، تەرهانی .

## ۱۰ ـ بالاکریوە

کەوتۆتە خاوەری لورستانەوە ، لە باکوورەوە ـ کێوی هەشتا پاڵو ـ تاف ، لە خاوەرەوە ـ ڕووبـاریسزا ، لە بـاشوورەوە ـ ڕووبـاری دز تا سالح ئاوا ، لە باتیرەوە ڕێگەی خورەم ئاباد .

ڕووبەری زەوییەکەی ٤٣٠٠ کم²

ڕووی باڵاکریوە ، شاخاوییەو سەختە ، سەری شاخەکانی کەمی

پانایی هەیە ، کێوی گێلان ٧٨ کم درێژو ٦ کم پانە ، لەپایینی ئەم کێوە ، ریزە گردولکەی بەردەلانییە ، شیوو دەرەی قوولی تێدایە .

زەوی‌یەکی فراوانی هەیە بە درێژایی ٣٠ کم ، لایەکی بە کێوی گیالان‌و لایەکەی تری بە شالی‌ری‌وەیە .

ئاژالیان لێرەوە تێدەپەرێت ، لە بەر تیژی بەردەکانی پێ‌یان زامدار ئەبێ ، لە هەندێ دەرەکانیدا ئەشکەوتی هەیە ، ئاوو درەختی لێ نزیکە .

کێوی کەبوتەران ـ کیوی قەلاونج ـ کێوی بۆکان ، مسورخ ـ گردگانە ـ میشەکیو ، ئەمانە ریزی دووەمی کێوەکانی ئەم بەشەن .

کێوی دەهلیج ٦٠٠ کم بەرانبەری کێوی گیالانە ، کێوی کورد ، کێوی خەزال ، هەشتا پالو ، لە کێوەکانی ئەم بەشەن .

رووبارەکانی ـ کەشکان لە باکووری خۆرئاوای بالاکریوەوە ، لە خۆرئاواوە ، سیەمەرە بەرەو خاوەر ، ئاوی سزار ، رووباری زال ئەخشی ، چەمی بچووکی خەزال لکی رووباری کەشکانە ، زەوی دەهلیج ئاودێر ئەکات .

ئاوی گول‌گول لە بادامکەوە دێت‌و تێکەلی کەشکان ئەبێ .

ئاوی فەنی لە ناوەندی داربراوی گێلانەوە ئەروا تێکەل بە سیامەرە ئەبێ .

ئاوی لیلاق بە گیالاندا ئەروا تێکەل بە سیامەرە ئەبێ .

ئاووبای ـ گەرمەسیرە ، هەوای‌گەرمە .

رێگەکانی ـ مەلبەندێکی شاخاوی‌یە ، هاتوو چۆی‌سەختەو گوزەرگەی هەیە .

خێلەکانی :

١ ـ دێرگوند ـ چواربەشە [ بەهارەوەند ، قەلاوەند ، زلیخاوەند ، میر ] ، هەر یەکە لەمانە گەلی تیرەن .

٢ ـ خێڵی جووتگی ـ ئاغارەزایی ، ئاغامیرزایی ، ١٥ گوندو ٨٢٩ خانەوادەن .

کشتوکاڵی ـ لەبەرئەوەی زەوی‌یەکەیان شاخاوی‌یە ، کشتوکاڵیان کەمە ، ئاژاڵداری ئەکەن ، لەوەرگای زۆریان هەیە ، دانەوێڵەیان کەمە ، لێرەواری زۆرە ، هەموو جۆرە داری بەری‌و بێ‌بەری هەیە .

کانەکانی ـ لەگول‌گول موینایی ، بەردی خەلوز لە پاپی ، خوی لە ژێر تەنگی پون ، نەوتی رەش لە هەزارپشت و تەنگی فەنی گوگردی هەیە .

یادگاری مێژوویی ـ لە خەلیل تەنیشی قەلای نەسیر پاشماوەی شاری کۆن‌و لەسەرئاوی گل کەلاوەکانی شاری مەیانکۆن دیارە ، پردی کچ ، کۆنە ، لە پشتی تەنگی پردی زاڵەوە تاقەکانی ماوە ، هی شاری زاڵی کۆنە ، لە کۆکان ئەشکەوتی هەیە ، تاقەکانی لەبەرد تاشراوەو ماوە .

## ١١ ـ لوڕی گەرمیان

لوڕی گەرمیان چواربەشن [ گەرەکی ، مەنکرە ، ئەنارکی‌و قیرئاو ، دەشت لالەو کەهیران ] .

أ ـ گەرەکی ـ لەناوەندی بالاکریو دایە ، جێگایەکی شاخاوی‌و سەختە .

لە باکووری‌یەوە ـ کێوی گردخانەو بەهەشت‌کێو ، لە خاوەرەوە ـ کێوی کرس‌و بێ‌ئاو ، لە باشوورەوە ـ کێوی چاوانی ، لە باتیرەوە ـ تەختی جوت .

رووبەری ـ ٩٦ کم$^2$ .

کێوەکانی ـ گردکانە ، بە هەشت‌کێو ، چاوانی ، رەهیاب .

رووبارەکانی ـ زاڵ ـ لە چلگادەڕی بەرەو باشوور ئەخشی .

ئاووبای ـ مام ناوەندی‌یە ، کانیاوی ساردی هەیە .

رێگەوبانی ـ لە باکوورەوە ملەی مور ، ملەی خەروسان ، ملەی لاومی ، لە باشوورەوە ملەی تەلنی ، ملەی چوبە ، لە باشووری خۆرئاواوە رێگەی دیك و پردو ملەی شالی رێ .

دارستانی زۆرە ، داری بەروو کەوت و داری جەنگەڵی تر .

پاشماوەی دیرینی ـ لە ناوەندی گەرەکی لە تالبئەلی ، قەلاو کەلاوەی کۆن هەیە .

ب ـ مەنکرە :

لە باکوورەوە ـ کێوی چاوانی ، لە خاوەرەوە ـ کێو باریك ناو ، چاوانی .

لە باشوورەوە ـ کێوی چنار ، لە باتیرەوە ـ چاوانی و تگمانی .

رووبەری ـ ٢٨ کم × ١٨ کم ئەبێ .

مەنکرە ، بەندەرێکی سەختی بالاکریوە ، بەو کێوانەی لەسەرەوە باسکران ، ئابلوقە دراوە .

رووباری ـ چەمێکی بچووکی هەیە لە گردئاوەوە دێتە دەرێ ، لەپایینی مەنکرەوە ئەخشی بۆ سنووری قیرئاو رووباری ئەنارکی پەیدا دەکەن .

ئاووبای ـ مامناوەندی یە ، لە کێوەکانی کانیاوی سارد هەیە .

رێگەی ـ ملەشیخ ، ملەی گڵکەبود ، بەرەو ملەی تکال لە خوارووی رێگەی گولکاو ، رێگەی ملەی چنارە ، لە باتیرەوە رێگەی کاس تا شانە .

کشتوکاڵی ـ زەوی و زاری باشی هەیە ، سەد باخی هەیە ، لەکانیاوە ساردەکانی کێوەکانیەوە ئاودێر ئەکرێن . دانەوێڵەو گەنمەشامی و داری جەنگەڵی هەیە .

جـ ـ ئەنارکی و قیرئاو ـ کەوتۆتە خاوەری مەنکرەوە .

له باكوورەوە ـ كێوی بێئاو ، كوس ، له خاوەرەوە ـ كێـوی‌كاك‌و مەهمود ئەلی ، لەباشوورەوە ـ كێوی تەنگوان .

له باتیرەوە ـ سەنگ گرەوكێوی باریكاو ، چنارەو هوسەینی .

رووبەری ـ ١٨٠ كم٢

كێوەكانی ـ دەربەندی ئەناركی سەختە ، كێوەكانی بـاكووری بێ ئـاوە ، له باشـووری قیراوەوە كێـوی تەنگـوان ، سەختـرین كێـو ئـەم مەڵبەندەیە .

رووباری ـ رووباری بلا له سنووری ئەناركی‌و قیرئاوەوە بەرەوخوار له هاوینا وشك ئەبێ .

ئاووبای ـ رادەی گەرمی ئەگاتە ٥٠ پلەی‌سەدی لەبەر هەتاو

رێگەی ـ ملەی بەسبەس ، رێگەی سەر پرد .

كشت‌وكاڵی ـ بە زۆری دێمە ، دانەویڵەو برنجی هەیە له دەربەنـد درەختی بەری له دەربەندی ئەنـاركی باخی هـەیە ، لەبـەر چاو دێـری نەكردنی ، بەرهەمی كەمە .

كانەكانی ـ نەوتی رەش له قیرئاو ، خوێ له نزیكی ئەمیر سـەیف مونایی له خاوەری ئەناركی .

پاشماوەی مێژوویی

أ ـ قەڵاو گۆڕستانی كیسرا ، چاڵاوی بەرد له چورەوەند .

ب ـ له حاجی باریك ـ ئاوی قەڵایەك كه پاشماوەی ماوە .

٢ ـ دەشت لالەوكەهیران ـ كەوتۆتە باتیری باڵاكریوە . له باكوورەوە ـ كێوی گڵ ، له خاوەرەوە ـ قیرئاوو كێوی لەك‌و گیاكێو .

له باشوورەوە ـ كێوی تەنگوان ، له باتیرەوە ـ رووباری سزار .

رووبەری ـ ٧٢ فرسەنگێ .

كێوەكانی ـ كێوی‌دز ، لەك ، بێ‌ئاو ، تەخت‌قەڵا .

رووباری ـ رووباری سـزار ، چەمی دمـدم ، چەمی مـازو ، قەڵا شیخ .

ئاووبای ـ مام ناوەندی‌یە ، کـەهیرانیش وەکـو قیرئـاوە لە رووی ئاووباوە .

ڕێگەی ـ گدار ـ گریش ، لەگدار ـ تل‌مو ، لەگدار ـ سەرازکەن ، لەگدار ـ دەرەئان ، لەگدار ـ مەیان چاکان ، لەگدار ـ خازار .

کشتوکاڵی ـ بە زۆری دێمە ، درەختی جەنگەڵی هەیە .

یادگاری مێژوویی ـ لە دەشت لالە ، ئیمام زادە ، لە شازادە ئەهمەد گۆری کوری ئیمام موسای کازم .

## ١٢ ـ لەکستان

لە خاوەری باشووری کوردستانە تا سەرکەنداو ، بە هێڵی بەندەر دێلم‌و حەسارو بەندەر بوشەهر کۆتایی دێ ، تیشتگەی خێڵی لەکی مەزنە ، بریتی‌یە لە بەهبەهان ، بنکەی کێوی گێلۆیەو فەیلی‌یانەو بـەندەر دێلم و حەسارو بوشەهرە ، کەبەندەرێکی بازرگانی گرنگی سەر دەریایە .

ئاوریشم‌و پیستەو قاڵی پێدا ئەروا بۆ دەرەوەو شەکرو چاو قوماش‌و شمەکی زۆری بۆ دێ‌و پێدا تێدەپەرێت ، زیندەگی ئەم ناوچەیە وەکـوو لورستـان وایە ، بـەشە شـاخاوی‌یـەکانی ، دانـەوێڵەو میوەی هـەیە ، ئاژاڵداری ئەکەن ، پیشە سازی دەستی وەکوو رستن‌و بـادان‌و تەنـین‌و دارتاشی‌و کاسەو کەوچك دروست‌کردنی هەیە .

جێگا شاخاوی‌یەکانی زستانی درێژو هاوینی کورتە ، دەشتەکانی گەرمو هاوینی درێژو زستانی کەمو خۆشە ، گەرمیان و کویستان ئەکەن .

پارس وپشت لەسەر ئەم ناوچەیەن ، هەرچەندە سەر بە ئاستانی فارسە ، بەلام پارچەیەکە لە لورستان .

**چاوگ :**

١ ـ شەرەفنامە ـ ئەمیرشەرەفخانی پەتلیس .

٢ ـ تأریخ الکرد وکورستان ـ ئەمین زەکی .

٣ ـ جوغرافیای نیزامی ـ عەلی رەزمارا .

٤ ـ مێژووی مەردوخ .

٥ ـ زانیاری خۆیی‌و گەلی سەرچاوەی تری بیانی‌و دەست نووسی کەریم زەند .

---

**شیعری خەڵکی کەی دەگاتە شیعری من بۆ ناسکی**

**کەی پەتك دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا**

**ـ نالی ـ**

دەستەی نووسەرانی خولی سێیەمی گۆڤاری «نووسەری کورد»، هەر لەیەکەم ژمارەیەوە بڕیاری وابوو کە دەرگای سەربەستی بیرو باوەڕ بخاتە سەرپشتو، باوەڕی بە دڵسۆزیی گشت قەڵەمێکی کورد هەبێت، نەك هەر تاقمێك.. بەڵام بێگومانیشە سەربەستیی پێویستی بە ئادەمیزادی سەربەست هەیەو، ئەوی دیلی شتێك، هەرشتێك بێت، ناتوانێت سەربەست بێتو، هیچ شتێکیش بەبێ لەخۆ بوردنو قوربانی بەدیی نایەت لە ژمارەی «٣»ی گۆڤارەکەماندا وتارێکی کاك (عمر مارف بەرزنجی) مان وەکو رای رۆشنبیرێك لەسەر کتیبێکی کوردی بڵاوکردەوە ، وا لەم ژمارەیەشدا وەڵامی پرۆفیسۆر دکتۆر عز الدین مصطفی رسوڵ وەکوو خۆی چۆنی نووسیوە ئەوهای بڵاو دەکەینەوە ، ئەگەرچی ئێمە وا دەزانین ئەم وەڵامە پێویستی بەراست کردنەوەو چاککردنەوەو لێ لابردنی زۆر هەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی دوکتۆر عزالدین پرۆفیسۆرێکی کوردەو، هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەی لێ ناکرێت کە بەموو لە عیلمییەتو مەنهەجییتو مەوزوعییەت لابداتو، بەهیچ جۆرێك لە بیری پێشکەوتنخوازانەو دڵسۆزانە دەربچێت... بۆیە بەبێ دەستکاری وەکو خۆی بڵاومان کردەوەو، ئەو ئەدیبو نووسەرە کوردانەی پریشكو پڵاری لابەلایان بەرکەوتووە ئەگەر خوا نەخواستە تووشی گێروگرفتێك بوون ئەوە گوناهی ئێمەی تیا نییەو پرۆفیسۆر ئەگەر ئەم گۆڤارەیش نەبێ دەنگی خۆی هەر دەگەیەنێتە جێی خۆی..... خوێنەرانە ئەوەندە هوشیارن لەراستیی ئەم مەسەلەو گشت مەسەلەکانی تر بگەنو ئێمەیش پشتمان هەر بەو بڕوایە ئەستوورە بۆیە بە دڵنیاییەوە لەسەر خزمەتکردن بەردەوامین..

نووسەری کورد

# کەسێ شێتانە بەردم تێگرێ

# من بەرقی تێئەگرم(*)

**نووسینی : دوکتۆرعیزەدین مستەفا ڕەسووڵ**

**ـ تا وا نەزانن بێدەنگی بێوەڵامیو سەنگەر چۆڵکردنە . وا بە تاقە نووسینێك لە پەنجەرەوە دێمەوە ئەو مەیدانو گۆڤارەوە کە لە دەرگاوە لێی چوومە دەرەوە .**

**قازی ڕەئیسی ئەووەڵ ، تۆش موددەعیی عموومی**
**ئەم کارە چۆن سەرئەگرێ ، لەعنەت لە بابی ڕۆمی**
**لە سایەی دەهری دوون پەروەر ئەمێستە لەك لە لەك ئەدوێ**
**بە کۆلێکلکەوە ڕێوی لەگەڵ کەولی دەڵەك ئەدوێ**

**ــــ شێخ ڕەزا ــــ**

« نووسەری کورد » ڕەنگە بە مەبەسی دەرخستنی جیاوازیی ئەم خولەی بێ لەگەڵ دوو خولەکەی پێشوویدا لە ژمارەی یەکەمو سێیەمیدا هەندێ پلاری تێدا گیرایە هاوڕێم محەممەدی مەلا کەریمو وا بۆ ژمارەی

سێیەمیش بە دەستدروو شتێك پێگەیندرا كە عومەر مارف بەرزنجەیی ناوێك بووە بە مونەفیزو دەسكەلای هێرش‌بردنە سەر من‌و ووتاری بۆ بلاوكراوەتەوە .

تائێستا بەرپەرچی كەسم نەداوەتەوەو چی بەردم شێتانە تێگئیرابێ لێی بێدەنگ بووم . بەلام كە ئێستا لەم ڕۆژنامەی عەرەبی‌و ئەو گۆڤاری كوردی‌و ئەو كتێبی بێ‌ناوی خاوەندا هێرشێكی ڕێكخراوی ناڕەوام ئەكرێتەسەرو هێرشەكەش هەر شەخسی نی‌یە ، بەڵكو بیروباوەڕو باری ئایدیۆلۆژی‌و مێژووی ژیان‌و تێكۆشان‌و هەموو ئەوشتانەش ئەگرێتەوە كە لە نزیكەی سی ساڵی ژیاندا نووسیومن ، وەك بیانەوێ بڵێن ، نە هیچم كردووەو نە هیچم نووسیوە ، لەبەر ئەوە زۆر لە هاوڕێ نزیكەكانم ئەڵێن ، ئەبێ شتێك بنووسی ، چونكە ئەم شتانەی نووسراون ڕەخنە نین‌و بوختانن‌و لە هەستێكی پڕ لە ڕق‌و كینەی چەند ساڵەی چەند كەس‌و دەستەیەكەوە هاتوون‌و ڕق‌و كینەش بەرامبەر بە باری ئایدیۆلۆژی‌یەو لەو كونجەوە مێژووی ژیان‌و تێكۆشان‌و نووسینم هەموو گرتۆتەوە . ئەمەش رق‌و كینەی تاقە كەسێك نی‌یە ، بەڵكو كۆكراوەتەوەو كەسی زمان‌و قەڵەم ناپاكی بۆ هێنانەدی ( تەنفیز ) بۆ دۆزراوەتەوە .

ئەوەتە سەیری ئەم ووشانە بكەن « نووسەری كورد » لەمەوبەر نەیئەگرتنە خۆ : لەو ووتارەدا بەرامبەر بە من نووسراوە .

**— « زیاد لە پێویست لاپەڕەی ڕەش‌كردۆتەوە »**

**« بیروڕای نەشیاوو دەلاقەی گەورەی مێژوویی تی‌كەوتووە »**

**« ئەو نووسەرەی كە جلەوی سۆزو لەخۆڕازی‌بوونی بی‌سنوور بۆ قەڵەمەكەی شل‌ئەكات » .**

« ئیتر بەتەواوی لە پرۆگرامی زانستی‌یانە دەرئەچێت‌و جلەوی ختووکەو سۆز هێندە شل‌ئەکات‌و بەسەرهاتی لاوەکی تێ‌ئەترنجێنێ کە هیچ کامیان پەیوەندی‌یان بەوی‌تریانەوە نامێنێ‌و زوربەشیان جێی گومانن‌و لەم سەردەمەیشدا زۆر بە گران بەسەر خوێندەواراندا بازئەدەن » .

« هەر ئەم کارە دوور لە زانستی‌یەش نووسەری دووچاری چەندەها هەڵەی گەورە کردووەو لە بەرامبەریشدا زیانێکی فرەی بە مێژووی ئەدەب گەیاندووە » .

« بەڵام دوکتۆری پێشەکی‌نووس بە هەر مەبەستێك بێ : مێژووی ئەدەبی لە گرێژەنە بردووەو ویستوویەتی کاروانی ئەدەبیمان بەرەو ئەو جێ‌یە مل‌بنێ کە خودی مەبەستەکانی خۆی تیا بەدی‌بهێنێت‌و هەر بۆیە لەم‌ڕووەوە کۆمەڵێ هەڵەی لکاندووە بە مێژووی ئەدەبی کوردی‌یەوە » .

« نووسەر بە واتای خۆی بیری تیژە » .

« دووچاری ئاڵوزی‌ودرشتی‌یەکی تەواو بووە » .

« بێ‌موناسەبە چیرۆکێکی گوێ ئاگردانی کتێبی ( شانۆی ناومالْ ) ی سەفوەت لە یەکەم لاپەڕەدا قوت‌کراوەتەوە » .

« خۆ یەکێکی وەکو ( فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە ) نەبووە کە کەس نەوێرێ خۆی بکات بە خاوەنی‌و خواخوای دیزە بەدەرخۆنە کردنی تەمەن‌و بوونەکەی بێت !!! » .

« وەك عادەتی خۆی‌و بە بێ‌موناسەبە ( ن. ئاری ) ی مامی تێهەڵکێش کردووە » .

« پێشەکی‌نووس ... هێندە درشت‌و دەست‌کورت‌و بێ‌توێشەبەرە بێ »

« مەبەستم لەوە نەبووە کە سەفوەت شاعیرێکی هێند بەناوبانگەو نەتەوەی کورد پێویستی بە مێژووی ژیانی هەیە . بەڵکو مەبەستی سەرەکیم درشتیو دەستکورتیو هەناسەسواری نووسەرە لە کارەکانیدا » .

« ئەمەیش خەوشێکی گەورەیەو بە تەختی تەوێڵی کارەکەی دوکتۆرەوە لکاوە »

« لە پێشەکییەکەیدا چەندان قسەی تێهەڵکێش کردووە هیچ کامیان توخنی واقیع ناکەونو تێناگەم ئەم دەستهەڵبەستانە چی ئەگەیەننو لە چ کانیاوێك دەم تەڕئەکەن ؟ »

« شیعری کەسانیتری فارس کردبێو ترنجانبێتییە دیوانەکەی باوکییەوە »

« لەم ڕاستییە ڕووی وەرچەرخاندووەو بیروڕای سەیری دەربارەی شیعرەکان لەم پێشەکییەدا بە بێتێڕامانو هەست بە لێپرسینەوە کۆمەڵی قسەی شەنوکەو نەکراوی خستووەتە بەرچاو »

« بە بیرازکراوی لە شاعیرانیترەوە وەرگیراونو تێکەڵ بە شیعرەکان کراون » .

« پەنجەی لەئاست ئەم وەرگرتنو دەست بەسەراگرتنەی باوکی بەرز نەکردۆتەوە » .

« بەڵام بۆ حسابی خۆی بەئاگاو زرنگە » .

« گرنگ ئەوەیە بۆ خەڵکی قەپانەکەی بچووکترین شت ئەخوێنێتەوەو بۆ خۆیشی لێکدانەوەیەکی جیاوازی هەیە » .

« کەچی دوکتۆر شیعرێکی ئەم جوامێرەی بە پەڕو باڵەوە داڵقوت کردووە » .

( ئەم ووتانەی مونەفیزی ووتار تەواو )

جا بەرامبەر بەم هەموو هێرش و بوختانەو بەرامبەر بەم ووشە سەیرانەی لە فەرهەنگی هیچ ڕەخنەگرێك و هیچ گۆڤارێكدا جێیان نابێتەوە ئەبێ نەڵێم « لەجێێ سندان قوزەقورتە » و قوڕ نەدەم بەدەم ئەم چەشنە كەسانەدا تا ئیتر گوڤارێكی‌تر ڕووی‌نەیەت ئەم ووشانە بەرامبەر بە كەسانی وەك من « قوت‌كاتەوە » ؟

نووسینەكە بریتی‌یە لە دوو لایەن . یەكەم : بەدرۆخستنەوەی هەمووشتێكی دیار یا باش لە ژیانی خۆم و مامم و باوكم و باپیرم و هەموو كەس‌وكارمدا ، كە بە هەموو حسابێك ئەبێ من لە لاپەڕەی نووسینەوەو یادگاردا تۆماریان بكەم .

دووەم : بە پڕوپووچ و بێسوودو زیان‌مەند دانانی هەمووئەوشتانەی خۆم و مامەكانم و باوكم و باپیرم نووسیومانن و دۆزینەوەی كونجێك بۆ تانووت تێگرتنیان . ئەمە لەلایەك ، لە لایەكی‌ترەوە كابرای مونەفیز بەدەم هێرش‌بردنە سەر ئێمەوە كۆمەڵێك نووسەرو شاعیری ناوداریشی گرتۆتەوە . كە ئەمەش پیشەی خۆی‌و یەكێك لە ماموّستاكانێتی - ڕق لە هەموو كەسێكی لێهاتوو و كارامەو دڵسۆزو پەسندكردنی كەسانی(بێ كارە) و تەپۆو گێرەشێوێن .

با بێمە سەر ئەو لایەنانە :

مونەفیزی ووتار لەبارەی ژیان و مێژووەوە ئەم درۆیانەی هەڵبەستووە كە یەكەیەكە وەڵامیان ئەدەمەوە :

**١ - بناغەی چەند لاپەڕەی لەسەر ( درۆ ) یەك بنیاد ناوە كە گوایە من لە نوسخەی بە ڕەووف بێگەرد بەدیاری‌دراوی دیوانی سەفوەتدا مێژووی لەدایكبوونی سەفوەتم كردووە بە ١٩٠٩ .**

جا نازانم وەك مونەفیزی ووتار ئەڵێ : ڕەووف بێگەرد قورئانی بـۆ خواردبێ کەئەمە خەتی منەو من گۆڕیبێتم یا نا ؟ . بەڵام ئەوە ئەزانم کە ئەمە ( درۆیـە ) . بەڵێ من لە هـەندی نـوسخەدا چـەند هـەڵەی چاپم راستکردۆتەوە ، لەوانـە ١٩٠٥ی یەکـەم لاپەڕەم کـردووە بە ١٩٠٦و هەرگیز بە ١٩٠٩م نەکردووە وەك مونەفیز ئەڵێ ، هەر بۆئەوەی بناغەی درۆکانی لەسەر بنیاد بنێ .

## ٢ ـ لەدایکبوونی سەفوەت :

« ... نـەخێر بـەخەیـاڵما نـەهاتـووە لە باوکم بپـرسم ڕێـك کـەی لەدایکبووی » . بۆچ ؟

ئەوانەی ئاگایان لە ژیانی من هەیەو ڕق وکینە چاوی کوێر نەکردوون ئەزانن کە من لە ساڵی ١٩٥١ بەدوواوە هەر بە سەردان شاری سلیمانیم دیوە ، لە ساڵێك کەمتری موعـەلیمی نەبێ ، ئیتـر ماوەی درێـژی دوور کەوتنەوەشی تێدا بووە . ( خوێندنی مـاوەیەکی زانستگـا ، دەرکردن لە زانستگـا پاش بـەشداربـوونی ڕاپەرینی تشـرین ، چەنـد جار گـرتن و بەندیخانە ، ماوەیەك موعەلیمی لە قەڵادزەو قەمچووغە ، دەربەدەربوون و ئـاوارەیی شام . چـوونە زانستگـای بەغـداو بـۆ خـوێنـدن ڕۆیشتن لە ١٦/٣/١٩٦٠دا بۆدەرەوە ... هتد ) . جا لەبەر ئـەوەو تا لە خـوێندن گەڕامەوە بەخەیاڵدا نـەهاتـووە کە ڕۆژێـك ئەبێ ئـەکەومـە چاپکـردنی بەرهەمەکانی باوکم و پێویستم بە نووسینی مێژووی ژیانی ئەبێ . تەنانەت خوێنەران ئاگادارن کە لەپێش ئەم دیوانەدا چیم چاپکردبێ ، بێباسی ژیانی باوکم و مامم چاپم کردوون . ( گولستان ، شانۆی ناوماڵ ، ڕابەری حەج ، هەروەها ـ هۆنراوەکـانم ـی ن . ئاری ) . بـەڵکو دیسـان بۆ مێـژووی

پێوەندیی ناو کەڵەپیاوان و مەردان ئەیگێڕمەوە کە ئەمەش هەر پیاوی خۆی تێی ئەگا ، کە مامۆستا عەلادین سوجادی زۆر دڵگیر بوو کە لە پێشەکیی ( شانۆی ناوماڵ )دا پاش باسی پێوەندیی مامۆستایی و قوتابێتیی نێوان ئەوو سەفوەت نووسیبووم :

« ... بەڵام ئەمە لە ڕاستی یەك کەمناکاتەوە کە دەبێ من لە جیاتی ( سەفوەت )ی خوالێخۆشبوو دانی پێدا بنێم . ئەویش ئەوەیە کە ( شانۆی ناوماڵ ) پەیرەوکردنی ( ڕشتەی مرواری )یە هیچ نەبێ دەرچوون و برەوی ئەو وای لە سەفوەت کردووە ، کە لەپاڵ چەندمەیدانی تری نووسین و ڕۆشنبیریدا کە قەڵەمی خۆی تیا تاوداوەو دووابەدووا بەرهەمی پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی ئەکەین - دەستبداتە ئەم بابەتە نووسینەش »[1]

، چونکە مامۆستا سوجادی زۆر شانازیی بە مامۆستایی و باوکێتیی سەفوەتەوە ئەکرد[2] . ئەوەی پێ ناخۆش بوو لێرەدا من مامۆستاکەی کە باوکی خۆمە بکەم بە قوتابیی ئەو .

بەڵام وەك لە پێشەکیی دیوانی سەفوەتدا نووسیم . تێبینی یەکی دوکتۆر کامیل بەسیر لە ڕادیۆی کوردیی بەغداوە دەربارەی ( هۆنراوەکانم )ی ( ن. ئاری ) وای لێکردم کە بکەومە ژیان نووسینەوەی ئەوکەسانەی بنەماڵەکەمان کە بەناهەق پشتگوێ خراون و ئەگەر من باسی ژیانیان نەنووسمەوە وون ئەبێت . وائەزانم منیش یەکەم کەس نیم ئەگەر هەزارهەمیش نەبم لە مێژووی بیرو نووسیندا کە بەرهەمی بنەماڵەی خۆی چاپ بکاو شتێك دەربارەی ژیانیان بنووسی[3] .

وائەزانم هەرچی بەئینسافیشەوە تەماشای ئەو پێشەکی یە بکات ، تێ ئەگات کە عاتیفە ڕاینەکێشاوم و ئەوی باوەڕم پێی هەبووە نووسیومە . جێی داخیشە کە ئەو دیوان و پێشەکی یە لەڕووی ڕەسمی یەوە بە بەردەمی

یەکێك لە دەستەی نووسەرانی تازەی ئەو گۆڤارەدا ڕەت بوو . تکاشم لێکرد کە ڕای خۆیم پێ بڵێ : بەلام وادیارە کە ئێستا پاشگەزبۆتەوەو ئەیەوێ ئەوە بسەلمێنێ کە من ( لە بەرەوڕوو مامۆستایم‌و لەپاش‌ملە وا نیم .. ) ( گەردنی ئازاد بێ ) .

بەم‌چەشنە من ڕای کەسانی وەك کاکەی فەللاح‌و محەمەدی مەلا کەریم‌و شوکور مستەفاو عەلادین سوجادیم مەبەسەو هەمووشیان ئاگاداری ئەو پێشەکی‌یەن ( پێش بلاوبوونەوە ) ، ئیتر پێویست نی‌یە گوێ لە قسەی ناشی‌یەکی داخ‌لەدڵ بگرم .

## ڕاستیی مێژووی لەدایکبوونی سەفوەت :

ڕاستی وەك ووتم - تا دواڕۆژی ماڵئاوایی لەگەڵ باوکمدا زۆر مەبەسم نەبووە ئەم مەسەلەیە ساغ‌بکەمەوە ( زۆر کەسیش ئەمەی بۆ باوکی مەبەس نی‌یە ، من ئێستاش مەبەسم نی‌یە ) . چونکە بۆ شاعیر زۆرتر چەرخ‌و سەردەمەکە مەبەسە ، ساڵ‌و مانگ‌و ڕۆژی مردن‌و لەدایکبوون لە هەندێ حاڵەتدا نەبێ ئەو بایەخەیان نی‌یە . هەرچەندە ووردترو ڕێکتر بن باشترە . خۆ ئێمە زۆر لە شاعیرانی کۆنمان تەنانەت چەرخی ژیانیشیان ساغ نەبۆتەوە ، ئەوەتا یەکێکی وەك مەلای جزیری لە سەدەی یانزەهەمەوە تا حەڤدەهەم دەبڕێت‌و هێشتا هەر تەواویش نەبووە . خەڵکی ئەو هەموو درێژدادڕی‌یەیان دەربارەی ( نالی )و ساڵی مردنی بیست‌و هێشتا نەگەیشتووینە ئەنجام . ئەوەتا کەسێکی وەك ئەحمەد موختار جاف کە زۆر دەمێك نی‌یە شەهید بووەو ڕۆژی کوشتنی دیارە ، کەچی هەر لە سەرچاوەو دیوانە چاپکراوەکاندا ساڵەکە بە چەند جۆر نووسراوە . یا شاعیرێکی گەورەی وەك جەواهیری هەر لە ژیانی

خۆیدا ساڵی لەدایكبوونی بە چوار جۆر نووسراوەو خۆشی لە هیچیان دڵنیا نی‌یە . بۆ مێژووی لەدایكبوونی سەفـوەت ، پاش ئـەوەی بەشی زۆری كتێبخانەكەیمان دەستكەوتەوەو بەرهەمی زۆریم دی ، كە ئاگام لە زۆریان نەبوو ، كەوتمە سەر كۆكردنەوەو چاپكردنی بەرهەمـەكانی ، مـامۆستـا گیوی موكریانی كۆمەڵی شیعری ئەوو شتێكی دەربارەی ژیانی بۆ ناردم ، لەوێدا نووسرابوو ساڵی ١٣٢٤ لەدایكبووە . كە دیـارە ئەمـە خۆی لەو گەشتەی مامۆستا گیودا بۆ سلیمانی ساڵی ١٩٤٦ بۆی نووسیوە . ئیتر لە گێڕانەوەو قسەی ناومالّو تەنانەت لە پەساپۆرتێكی كۆنیدا كە نووسرابوو ( ١٨٩٧ )و ئەمەیان لەبەر زۆر هۆو زۆر سەرگوزەشتەی ناو بنەماڵەكە بە ڕاست نازانم . بەمجۆرە ( ١٣٢٤ )م كرد بە ساڵی لەدایكبوونی . كە خۆم بەپێی هاوكێشەكانی گۆڕینی هیجری بە میلادی لێكمدایـەوە ( ١٩٠٥ ) دەرچوو . تەنانەت مامۆستا سوجادی كە لە زۆركەس زیاتر لە سەفوەتەوە نزیك بـووە ١٩٠٥ی بە سـاڵی لەدایكبـوونی داناوە[٤] . مـامۆستـا مەلا عەبدولكەریمی مودەریسیش هەر ساڵی ١٣٢٤ی نووسیووە[٥] . زۆرجاریش نووسەران لە لێكدانەوەی هیجری بە میلادیی خۆیاندا ساڵو دوو ئەكەونە هەڵەوەو نموونە بۆ ئەمەش زۆرە بەتایبەتی چاپی دووەمی مێژووی ئەدەبی كوردی لە پەراوێزەكانیدا دەستنیشانی ئەم لایەنەی زۆر كردووە . بۆ ئەم گۆڕینە كە سەیری نامیلكەكەی ئۆربیلليم كرد ١٩٠٦/١٩٠٧ بەرامبەر بە ١٣٢٤ نووسرابوو ، ئاگاداری سەرپەرشتكەری چاپكردنی دیوانەكەم كرد كە ئەمە ڕاستكاتەوە ، بەڵام دیاربوو ناو پێشەكی‌یەكەی ڕاستكردبۆوەو لاپەڕەی یەكـەمی لەبیرچـوو بوو . كـە كتێبەكـەش دەرچوو لە هـەندێ نوسخەی دیاریدا ئەوەو هەندێ هەڵەی چاپیی‌ترم ڕاستكردەوەو كردم بە ( ١٩٠٦ ) .

نە ئەوساو نە ئێستاش زۆر مەبەسم نی‌یە ١٩٠٦ بێ یا ١٩٠٧ یا ...

هتد . چونکه ئەمە هیچ لە ژیان و بەرهەمی سەفوەت ناگۆڕێ .

مونەفیزی ووتار کە سەرتاپای نووسینەکەیی پڕکردووە لە هێرش بردنە سەر ( خۆم و بیرو باوەڕم و باوك و باپیرو خزمانم ) ئەڵێ :

« مەبەستم لەوە نەبووە کە سەفوەت شاعیرێکی هێند بەناوبانگە نەتەوەی کورد پێویستی بە مێژووی ژیانی هەیە » .

نەخێر نەتەوەی کورد پێویستی بە مێژووی کەسێك یا مەلایەك نییە ، کە بە هەموو ئازارو نەخۆشی و نارەحەتیی ژیانی خۆیەوە ٢٣ کتێبی بەکوردی نووسیبیی و پێویستی بە مێژووی ژیانی مەلایەك نییە کە لە ساڵەکانی سیدا ڕێکخراوەی سیاسیی بۆ کوردایەتی دروستکردبێ ( بڕوانە دوو پاشبەندەکەی مامۆستا سوجادی و مامۆستا ناکام ـ نازانم چۆن خاوەنانی ووتارو مونەفیزەکەی ئەوانیشیان بەدرۆنەخستۆتەوە ، بڵێی نەیانوێرابێ ؟! ) .

یا پێویستی بە مێژووی کەسێك نییە کە زمانی کوردیی بردبێتە ناو زۆر مومارەسەی ئاینیی کوردەوە . بەڵێ سەفوەت لای مونەفیزو مامۆستاو هاوەڵە ( کار )گوزارەکانی ئەوەندە پێوە خەریكبوون ناهێنێ . هەر لەبەرئەوە بۆ تەنیا جیاوازیی ساڵێك و بەتەواوی نەزانینی مێژووی لەدایکبوونێك بە من ئەڵێن : « ... مێژووی ئەدەبی لەگرێژەنە بردووەو ویستوویەتی کاروانی ئەدەبیمان بەرەو ئەو جێیە ملبنێ کە خودی مەبەستەکانی خۆی تیا بەدیبهێنێت و هەر بۆیە لەمڕووەوە کۆمەڵێ هەڵەی لکاندووە بە مێژووی ئەدەبی کوردییەوە » .

بەڵێ باوابێ ـ ئەگەر هەڵەی تاقە ساڵێك ئەم تاوانە گەورەیە بێ کە مونەفیز ئەیڵێ ـ ئەی ئەو هەموو پڕوپۆگاندەیە بۆ جوولەکەیەتی و بیری سەهیونیی پیسی ڕەگەزپەرست لە سێبەری « فەرهەنگی نالی » و کۆمەڵێ کتێبدا دەربارەی جوولەکە ڕۆژهەڵاتناسەکان ئەبێ چیبێ ؟

دیاره مونەفیزو هاوەڵەکانی لەم جۆرە لەگریژەنە بردنانە بێدەنگن .

بەلام ئەگەر میژووی لەدایكبوونی باوك نەزانین بەلای ئەوانەوە لەگریژەنە بـردنی میژووی ئـەدەبە . بـا پیٚیان بلێم کـە لە میژووی ڕاستـەقینەی لەدایكبوونی خۆشم دلنیا نیمو وەك ئەشزانن لە هەزارا نۆسەدو نەوەدو نۆ کەس یا زیاتر لە خەلکی ئەم وولاتە یەکی تەمووز بەڕۆژی لەدایكبوونیان دادەنین ، کەواتە ئەبێ زۆربەی ئەم میللەتە چییان لەگریژەنە بردبێ ؟ بۆ ١٩٠٤ی کتێبی قوتابخانەش من نەمنووسیـوەو منیش چیرۆکی ( گـوێ ئاگردانی !! ) باوکمم قوتنەکردۆتەوە ، چونکە دیارە کە بەشی ڕێزمانی ئەو کتێبە من نەمنووسیوە . خۆ ئەگەر منیش نموونە لەو کتێبەوە بهێنمەوە ئەوا لام نەنگ نییە . با مونەفیزی ووتارو هاوەڵەکانی ئەوەش بزانن کـە ئەو ( هێمن )ەی ئەمڕۆ بە درۆ بە شانو باڵیدا هەڵئەدەن ئەیووت ( شانۆی ناومال ) بەرزترین پەخشانی کوردییە .

هێرشی نارەوای مونەفیزی ووتار لەئاستی خۆمو باوکما نەوەستاوە بەڵکو ( ن. ئاری )ی مامیشمی گرتۆتەوە . حەزم ئەکرد خـوێنەر خـۆی بـچێتـەوە سـەرووتـاری ژمـارە ( ٦٤٢ )ی ڕۆژی ١٩٨٢/٦/١٧ی ( هاوکاری ) تا بزانێ بە بێموناسەبـە(ن. ئاری )ی مـامم تێهەلکێش کردووە یا ئەمانەتی نووسین ئەو شاعیرە دلسۆزەی هێناوەتە ناوەوە . کە زۆرکەس ئاگاداری لاپەڕەی هەولدانو فیداکاریی ئەونو قەڵەمی بەپیتی تا مردن لە نووسین نەکەوت . بەلام چونکە مامی منە ئەبێ هێرشی نارەوا بیگرێتەوە ، جا نازانم چۆن مامەکانی ترمی نەگرتۆتـەوە ؟ ئەبێ هێشتـا مامۆستاکەی دیوانی ( فائیز )ی پیشان نەدابێ ، یا وای شاردبیتەوە کە ئـەو نەیبینێو مـەملەکەتی « بیبلوگـرافیـا » گـەریی هـەردووکیشیـان نەگەیشتۆتە سەر ( فەیزی ـ مەلا محەمەد ) ... هتد ئەگینا ڕقو کینەی ئەوان بەرامبەر بە منو بنەماڵەکەمان گـەیشتە ڕادەیـەك بەشێـوەیەکی

نەخوێندەوارانە بوختانی وا گەورە بۆ مەولانا خالیدی نەقشبەندی دروستبکرێ کە دەبوو ئاسمانو زەویی بۆ بێلەرزە ، بەلاّم چونکە لە سەنگەری خۆیانەوە بوو سۆفیو شێخیش لێی بێدەنگ بوون .

ئەمە ئەم تەنیا ساڵە بوو کە مونەفیزی ووتاریوا لێکردووە بریار بەسەر ( ٢٠ ) کتێبو سەدان ووتاری مندا بداو بڵێ مەبەسی سەفوەت نییە : ( بەڵکو مەبەسی سەرەکیم درشتیو دەستکورتیو هەناسە سواریی نووسەرە لە کارەکانیدا ) . چا ئەگەر ئەم بەرهەمانە هەموو ئەنجامی ( درشتیو دەستکورتیو هەناسەسواری ) بن ، منیش حەزم ئەکرد « وورد » بمو ( دەستدرێژ بم ـ بەلاّم بۆ بەرهەمی خەڵكدزین نا )و ( هەناسەشم درێژ ) بێ تا کتێب ببن بە سەدانو ووتار لەجێی سەدان هەزاران بن . بەلاّم ئەگەر خاوەنی ئەو کارانەی لای مونەفیزی ووتار خۆی ( دەبنە سەرچاوە ) ( درشتو دەستکورتو هەنا سە سوار ) بێ ، ئەبێ کام نووسەرمان ووردو دەسەلاّتدارو نەفەس درێژ بێ ؟ . وائەزانم لای ئەو کەس نییە . چونکە ئائێستا نەمدیوەو نەمبیستووە کە بەخێر ناوی هیچ نووسەرو شاعیرێکی دڵسۆزو خاوەن ئیبداع بێنێ .

مونەفیزی ووتار نووسیویە : گوایا من ئاگادار نیم کە شاعیرێکیتر بە ناوی ( سەفوەت )ەوە هەیە . ڕەنگە ئەم ئاگادار نەبوونەش تاوان نەبێ . بەلاّم من باسی ئەوەم نەکردووە کە ( سەفوەت ) تەخەلووسە یا ( مستەفا سەفوەت ) ناوی مورەکەبە . ( ئای کە مامۆستاکەی لە گرێی نەبوونییەوە بەمناوە مورەکەبانە توورە ئەبێ ) . پاشان ئەو سەفوەتەی کوڕی ساف پاش مستەفا سەفوەت شیعری ووتووە . هەروەك مەرج نییە کە باسی سەفوەتی زاناو نووسەرو شاعیر کرا ناوی هەموو سەفوەتەکان ڕیزبکرێ بەو مستەفا سەفوەتە لاوانەشەوە کە هەر بەخۆشیی ناوی ئەوەوە لە شاردا ناونراون مستەفا سەفوەت ، جارەهای جاریش باسی چەند ( موخلیس )ی

شاعیر کراوەو لە کەسیش ڕاست نەبووینەتەوە کە بۆچی باسی حاجی مەلا ڕەسووڵی دیلیژە ناکەن .

## ٢ ـ باسی گرەوی ساڵی ١٩٢٠ی ڕۆژنامەی پێشکەوتن و بەشداریی سەفوەت :

کە بناغەی نووسینێك لەسەر ڕاستی دانەنرا ، ئەبێ دێڕبەدێڕیش بۆ ئەم ناڕاستی یە بگەڕێیت .

جاری من وەك مونەفیزی ووتار بۆم هەڵئەبەستێ لە لاپەڕە ٢٠٦ی ( الواقعية في الادب الكردي )دا نەمنووسیوە چیرۆکی لە ( خەوما )ی جەمیل سائیب لە گرەوی ١٩٢٠ی مێجەر سۆندا ( کە مونەفیزی ووتارو مامۆستاکانی ئەویش و ئەدمۆندسیش لە من باشتری ئەیناسن و وا بە ـ ئێلی بانستەر سۆن ناوی‌بردووە ) بەشداریی کردووە . بەڵکو نووسیومە لە گرەوێکی ساڵی ١٩٢٥دا بێ‌دەست نیشانکردنی ( مێجەر سۆن )و ( پێشکەوتن ) ، دیارە ئەم دوو قسەیەش لە یەك جیاوازن . بەڵێ من بە بیستن بیستبووم کە جەمیل سائیب بەم چیرۆکە پاداشی وەرگرتووە . کاتێکیش کە هەزارەها کیلۆمەتر دوور لەو وولاتەوەو ، چارەکە چەرخێ لەمەوبەر ئەو کتێبەم نووسی ، نە ڕۆژنامەکانی ئێرەم لە بەردەستدا بوو ، نە ئەشمتوانی بێمەوەو نە ئەم مونەفیزەش ئەوسا بووبوو بە موفتیی « بیبلۆگرافیا »ی کوردی‌و ناویشی نەبوو تا نامەیەکی بۆ بنووسم و نە ( لە ( خەوما )ش چاپ‌کرابۆوە . لەبەرئەمە ئەو تاقە دێڕەم نووسی‌و نە ( دنیا قوڵپی )و نە ( کابە کەچ‌بوو ) . ئێستا ئەڵێم ڕەنگە ئەوەی من بیستوومە پاداش و گرەوێکی‌تر بێت . یا هەر ئەوەی( پێشکەوتن ) بێتو من وام‌بیستبێ کە ئەوە بۆ ( لەخەوما ) بووەو بۆ ( بۆچڕووك ) نەبووە . یا بۆ

ئەبێ لە کتێبێکدا کە کاتی چاپکردنی من لە گوندی ( دەرگەڵە ) ئەژیام‌و توانای بێرووت چوون‌و سەرپەرشتی کردنیم نەبووەو سەدان هەڵەی چاپی تیایە لە ( ناوو ژمارە )شدا ( کە لای هەندێك کەس بیرو ئایدیۆلۆژیا هیچ نی‌یەو هەر ئەمە مەبەسە ) بۆ ئەمیش هەڵەی چاپ نەبێ‌و ( ۱۹۲۰ )ەکە ڕاست بێت .

پاشان نووسەر چوزانێ سەفوەت لەناو ئەو بەشدارانەدا نەبووەو بە ووتە پڕ لە ئەدەبەکانی خۆی ئەڵێ : ( لە دوورو نزیکەوە سێبەری سەفوەت ) دیار نی‌یە ؟ ئەگەر ناوەکان لە کاتی خۆیدا نووسراون ، ئەوا هەر نەیسە ، ئەی هەر لەبەرئەوەی ئەو لە دوو کەسی پرسیوە ؟ ئەی بۆچ ئەبێ ئەوانەی ئەو لێی پرسیون ڕاستبکەنو ئەوانەی من لێم پرسیون درۆ بکەن ؟ . یا کێ ئەڵێ مونەفیزێك کە ئەم هەموو درۆیە بۆ بەرژەوەندیی هاوسوێندەکانی خۆی بکا ئەو ناوەشی نەسڕیوەتەوە . پاشان ئێمە مامۆستا نەجمەدین مەلا دەناسین ، ساڵی ۱۹۲۰ لەکوێ بووەو چی بووەو لە چ پلەیەکدا بووە تا ئاگای لە بەشدارانی گرەوێکی ئاوا بێ . ئەی مونەفیزی ووتار لە کاتی ژیانی نەجمەدین مەلادا تەمەنی چەند بوو ، تا لەگەڵ ئەودا دانیشێ‌و ئەم چەشنە پەرۆشەی هەبێ ؟

بە هەموو حاڵێ ئەم درێژەپێدانەی ناوێ‌و بەشدار نەبوونی گرەوێکی وا لە شاعیری‌و کۆششی سەفوەت کەمناکاتەوە . بەلام لێرەشدا ناڕاستی‌یەکی‌تر هەیە کە گوایە سەفوەت ئەودەمە تەمەنی ۱۱ ساڵ بووە . نەخێر بە هەموو ئەو حسابانەی باسکرا ۱٤ ـ ۱٦ ساڵ بووەو زوربەی ئێمەش لەوتەمەنەدا دەستمان داوەتە ئەو چەشنە نووسینانە . ئایا بۆ ئەمەش شایەت‌و قورئانی ئەوێ ؟

ئەگەر بشێ نموونە لە ژیانی خۆمەوە بهێنمەوە ئەوا چەند مامۆستایەکم ماون کە خۆیان یەکەمجار لە ڕۆژنامەی سەردیواری

قوتابخانەی فەیسەڵیەدا لە تەمەنی ١٠ ـ ١١ ساڵیدا نووسینی ساکاری خۆمیان بۆ بڵاوکردومەتەوە . ڕۆژنامە عەرەبی یەکانی ساڵی ١٩٤٨یشم لە بەردەستدا نی یەو عاشقانی درۆی بیبلۆگرافیا داوای ژمارە ئەکەن ئەگینا هەر لەوساڵەدا ژمارەو ناوی ووتاری عەرەبیشم بۆ ئەبردن . خۆ بەشدارانی نەورۆزەکانی ١٩٤٦ ، ١٩٤٧ ، ١٩٤٨ زۆریان ماون و ئاگادارن کە هەرساڵەیان لە پۆلێکی ناوەندیدا بووم و بە شیعرو ووتار ( با ساکاریش بێت ) بەشداری ئەو نەورۆزانە بووم ، خۆ باسی زوو چوونە بەندیخانەی بۆ ناکەم ، چونکە کەسانێکی کە پێوەندی یان بە کۆڕی تێکۆشانی نیشتمانی و شۆڕشگیری یەوە نەبێ لە ئازاری نیشتمانپەروەرانو تێکۆشەران ناگەن و ئەوەیان ( لا مەبەس نی یەو بایەخیشی نی یە لایان بەڵکو بەپێچەوانەوە ) .

کە باسی ئەو گرەوانەی کرد ئەبوو باسی گرەوێکی تریش لەوبارەیەوە بکات کە ( ن. ئاری ) تێیدا بەشدار بووە[٦] .

٣ ـ مونەفیزی ووتار ئەوەی لەبیرنەچووە کە بە موناسەبەتی باسی کتێبی ( الواقعية في الادب الكردي )یەوە پلارێکی تر بگرێتە من کەوا بەو کتێبە شەهادەتنامەی ( کاندیدات )م وەرگرتووە .

ئەمەش چەند وەلامێکی ئەوێ :

أ ـ بەڵێ ئەو شەهادەتنامەیە لە شوێنی خۆی ( کاندیدات )ی پێ ئەڵێن ـ ( کاندیدات ) واتە ( مرشح ـ پاڵێوراو ) واتە ( پاڵێوراو لە فلان زانستدا ) ـ کەواتە وەك مونەفیزی ووتارو هەموو دوژمنانی زانستی سۆشیالیستی تێی ئەگەن ئەمە جنێو نی یە ، بەڵکو پلەی زانستی یە ، لەبەرئەوەش ( پاڵێوراو )ە چونکە ئەمە سەرەتای چوونە ناو جیهانی زانایی یەتی . ئەم شەهادەتنامەیەش لە هەموو جیهاندا بەرامبەر بە ( PHD ) ی ڕۆژئاوا واتە ( دکتۆرای فەلسەفە )یە . کۆماری عیراق دووای

هـەموو وولاتـانی جیهان لە سـاڵی ١٩٦٩دا دانی بەم ڕاستی‌یـەدا نـاو بەرامبەر بەو شەهادەتنامەیەی دانا .

ب ـ ئەبێ بووترێ کە لەپاش ( کاندیدات ) بە نزیکی دە ساڵێك پلەی ( دوکتۆر ناووك ) دەدرێ . واتا ( دوکتۆرای زانست ) چونکە ووشـەی ( ناوکا ) بە ڕووسی ( زانست ـ عیلم ) دەگرێتەوە . لەگەڵ ئـەم پلەیەدا لەقەبی ( پرۆفیسۆر )یش ئەدرێ . لە عیراقدا تا ئێستا تەنیا دوو کەس ئەم پلەیەیان دراوەتی کە پرۆفیسۆر دکتـۆر کەمـال مەزهـەر ئەحمـەدو نووسەری ئەم ووتارەن . لە خەڵکی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیشدا ژمـارەکە هەر یەکێکی‌تر زیاد ئەکات .

ج ـ هەقمە شانازی بکەم کە هەردوو پلەیانم لە ئەنجامی کۆشش‌و هەوڵی خۆمدا وەرگرتووەو ڕووشم هاتووە بیست ساڵ لەمەوبەر نامەی پلەی یەکەم‌و حەوت ساڵ لەمەوبەر نامەی پلەی دووەم بلاوبکەمەوە . ئەبـوو خەڵکی‌تریش وایان بکردایە . دیارە کە بۆ ئەم مەبەسانەش پەنام نەبردۆتە بەر بەسەر مامۆستاو هاوەڵدا گریان‌و پاڕانەوەو هەڕەشەی خۆکـوشتن‌و کەسیش یارمەتیی نەداوم . ( کەسێکیش کەسە ئەلفێکی بەسە ) .

د ـ نازانم کە ( ١٩٢٥ )ێك بووبێ بە ( ١٩٢٠ ) لە مەسەلەیەکی بچووکدا ، بە کام ویژدان هەر لەبەرئەمە ـ ( ئەمەیش خەوشێکی گەورەیەو بە تەختی تەوێڵی کارەکەی دوکتۆرەوە لکاوە ) ؟ . ئەگەر مونەفیزی وتارو مامۆستاکانی ئەوچەشنە خەوشەیان لە کارەکانیانا ئەوێ ، ئەوا هەر زۆر زۆرن . خۆ لایەنی کۆنەپەرستی‌و هەوڵی کورد بەدنـاوکردن‌و بـەرهەمی خەڵك دزینیش لەولاوە بوەستێ .

٤ ـ مونەفیزی وتار بە بێ‌شەرم ( سەفوەت ) بەدرۆ ئەخاتەوە چونکە بـاسی ئەوەی کـردووە کە لە منـداڵی‌یا شـەڕە شیعـری لەگـەڵ ( مـەلا حەمدوون ) کردووە ... هتد . بۆ وەلامی ئەمەش :

« ... له منالّیمەوە کە لە قوتابخانــەدا ، پاش خــوێندنی قــورئان‌و ئیسماعیل‌نامە دەستم بە خوێندنی ( گولستان ) کرد ، بـۆ جاری دووەم بەمەعنا خوێنـدم ، لە دەروونمەوە هــەستم ئەکـرد کە زیـاد لە هەمـوو خوێندنێك هەواخواهیم لەگەڵیا هەیـە ، تاڕادەیـەك ئەتـوانم بڵێم چیم لێ خوێندبوو ، شیعرەکانیم هەمووی لەبەربــوو . دێتە یـادم کاتی شــەڕی یەکەمی جیهانی بوو نزیکەی ٤٣ ساڵ پێش ئەمڕۆ ، ( ئەمەی لە ١ ی مایسی ١٩٦١دا نووسیوە ـ ع. م ) مەلاکانی ئەودەمە ـ ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ـ چووبوون بۆسەیران بۆ ( کارێزی حاجی مەلا عەلی ) . ئەوانەیان لەیادمن ( شێخ بابەعەلی )و ( مەلا حسەینی پیسکەندی )و (مەلا عەبدوولعەزیزی موفتی )و ( حاجی مەلا ڕەسووڵ )ی بـاوکمن . ( مەلا حــەمدوون )ی حافزی کوێری بلیمەتیش لەوێ بوو ، بە باوکمی ووت : ئـا مستەفــام بۆ بانگ‌کە هەر باسی ئەکەیت . باوکم بانگی‌کردم . حەمدوون ووتی : شەڕە شیعر ناکەی ؟ ووتم : با . نــەمئەزانی حــەمدوون کێیـەو شەڕەشیعـر چی‌یە ؟[٧]

پاش‌ئەوەی سەفوەت بۆنەوەی تازەی شەرح‌ئەکا کە شەڕە شیعری ناو حوجرەو مەلایـان چی‌یە ، ( کــە ڕەنگە مــونەفیـزی ووتار کــە لەناو خوێندەوارانا پەروەردە نەبووە هەر لەوێوە فێربووبێ شەڕە شیعر چی‌یە ) پاش ئەمە نووسیویە :

« ... سێ‌چارەك سەعات لەگەڵ ( حەمدوون ) ڕۆیشتم . جا پەکی خستم . مەلا حسەین ووتی : حەمدوون هیچ هونەرنەبوو . ووتی : بۆچ ؟ وتی : تۆخۆت کوتووپڕ شیعر ئەڵێیت لە تیپە گرانەکانا وەك ( پ )و ( ژ )و ( ڤ )و ( گ ) . ئــەو منالە نــاتــوانێ شیعــر بــڵێ ، چی لەبــەره ئــەوە ئەخوێنێتەوە . حەمدوون ووتی .وایە . حاجی مەلا ئاگاداری ئــەم کوڕە بە .

مەبەستم لەم چیرۆکە ئەوەبوو هەر لە منالیمەوە شەیدای گولستانی سەعدی بووم ، لەبەرخۆمەوە شیعرم دائەنا ، هەرچەند لە بازاڕی شاعیرو بویژانا نرخی نەبوو ... »[8] .

جا بەرامبەر بەو ئەدەبە بەرزەی مونەفیزی ووتارو پاڵپیوەنەرانی لە بەدرۆخستنەوەی ( سەفوەت )دا ئەڵیم :

أ ـ سەفوەت خۆی دەستنیشانی ئەوەی کردووە کە ساڵ ١٩١٨ بووە .

ب ـ تەمەنی دیارە ئەودەمە ١٢ ـ ١٣ ساڵان بووە . واتە وەك خۆی ئەڵێو ئێمەی کوڕەمەلاش باشی ئەزانین لەو تەمەنەدا هەموو منالێکی لێهاتووی سەر بە ئاوو هەوای خوێندەواری زیاد لە گولستانو ئیسماعیلنامە ، پەندی عەتتارو ئەیشودەی شێخی نۆدێو ( نصاب الصبیان )و ئەحمەدییان لەبەر ئەکرد .

ج ـ مونەفیزی ووتار چونکە کوڕە مەلاو کوڕە خوێندەوار نییە ، دیارە لەو ئاوو هەوایە ناگات . بەداخەوە لە ئاوو هەوای پێگەیشتنی نووسەرانی ئەمڕۆشمان نەگەیشتووە . لەبەرئەوە نازانم بە چ کومپیوتەرێ حسابی کردووە کە ( سێچارەك سەعات ) شەڕە شیعر ( ٣٠٠ تا ٥٠٠ ) دێڕ شیعری کلاسیکیی کوردیو فارسیو عەرەبی لەبەربوونی ئەوێ ؟ ( جارێ بۆ ئەبێ هەر کلاسیکی بێو بە سێ زمانیش بێ؟ شەڕە ، شیعری جارانی ناو مزگەوت ئەم مەرجە بیبلوگرافیانەی تێدا نەبوو ) .

خوێنەری خۆشەویست : باوەڕبکە ئەم هەموو پەنجەی گومان ڕاکێشانە ناهەقو نارەوایە وای لێکردم کە بە ( سەعاتگرتن ) تەجروبەیەکی شەڕە شیعر تۆمار بکەم . هەرچەندەمکرد بە بێهەناسەو وەستانی زۆریش هەر دەقیقەی ٥ ـ ٦ دێڕە شیعری بەحری تەویل ) ی بەرکەوت ( کە ئەو بەحرەش مەرج نییە ) . کەواتە :

٦ × ٤٥ = ٢٧٠ ÷ ٢ = ١٣٥ ، واته ١٣٥ دێڕه شیعر لەوچەشنە شەڕەشیعرەدا بەکاردێت . خۆ بۆ کەسێکی زیرەك و کوڕە مەلایەکی گەورەی شارەکەی وەك سەفوەت ، کەوا بزانم دوژمنەکانیشی شایەتیی لە زیرەکی زیاتریشی بۆئەدەن ، لەوتەمەنەدا زۆر لەوە زیاتری لەبەربووە . بۆچی ئێستا مندالی دەرچووی سەرەتاییمان نی‌یە لە ٣٠٠ دێڕ زیاتر ( گۆرانی و سروودو شیعر )ی لەبەربێ کە هەموویان بەکەڵکی شەڕەشیعر دێن . کەچی مونەفیزی ووتار کە مامۆستاکانی ئەڵێن ـ قوتابی‌یەکی زیرەك نەبووە ، ئەم ڕاستی‌یەشیان نازانێ . ئەوەش نازانێ کە ئەمە لەگەڵ ( پاڤلۆڤ )ی ڕابەری من [ نەك ( بافلوف )ی لەمەڕ عیزەدین ]و لەگەڵ ( فرۆید )ی کەسانی هەندەری ئەویش ڕێكدەکەوێ . جا نازانم لەلای ( ڕاحێل )و ( ئەشکەنازی )و ( نیتشە )ی لەمەڕ ئەوان چۆنە ؟

هـ ـ بەڵێ مەلا حەمدوون هەر زۆر بلیمەت بووەو هیچ نەبێ ( سەفوەت ) خۆی چەندجارو لە چەند شوێندا ، بەتایبەتی لە ( شانۆی ناومالّ )دا باسی ئەوەی کردووە . بەلام کێ ئەڵێ بۆ شیعر لەبەرکردنیش هەر وا بووە ؟ ئێمە ئەزانین کە حافز زیاتر بایەخ بە لەبەرکردنی قورئان و موناجات ئەدەن و کەم شیعر لەبەرئەکەن . بەتایبەتی حەمدوون کە قورئان خوێندنیشی نەکردووە بە پیشە . هەروەك پێوەندیی ئەوکوێرە بلیمەتە لەگەڵ جیهانی شیعردا هەر ٢ ـ ٣ قەسیدەیەو بەس .

د ـ هەرچەندە حیکایەتەکە باسی سالّی ١٩١٧ ، ١٩١٨ ئەکات ( چونکە لە ١٩٦١دا ئەڵێ نزیکەی ٤٣ سالّ پێش ئەمرۆ ) . بەلام ئەوەی مونەفیزی ووتار ئەڵێ کە گوایە حەمدوون سالّی ١٩١٧ مردووە ڕاست نی‌یە . حەمدوون پاش ئەوە مردووە . ئەگەر بشچینەوە سەر قەسیدەی سەفەربەرو باسی گرتنی ( بەسرەو فاو )ەکەی هەندێ شتمان بۆ دەرئەکەوێ . دەمێکە بە هەندێ کەرەسەوە خەریکی باسێکی حەمدوون و

موناقەشەی سالّی مردنیم . با ئەمە بمێنێ بۆ دەرفەتی خۆی . بەلاّم ئەمەوێ ئێستا ئەوەندە بەگوێی هەندێ کەسدا بچرپێنم کە چ مونەفیزی ووتارو چ هەندێ لە مامۆستاکانی بەوەی کتێب و ڕۆژنامە کۆئەکەنەوەو لە خەلّکی ئەشارنەوە خۆیان کردووە بە سەرچاوەی ڕاستی بیبلۆگرافیای کوردی ، ئەمە ڕاست نی یە . تەنانەت کەسێك کە لە نووسیندا دەست پاك نەبێ و نووسینی خەلّك بە ناوی خۆیەوە بلاّوبکاتەوە ، باوەڕ بە ڕاستیی بیبلۆگرافیا شارراوەکانیشی ناکرێ .

**٥ ـ سەفوەت و تەفسیر :**

چەند دێڕی بەوە ڕەش کردۆتەوە کە گوایە من (جلّەوی سۆزو نەگونجان )م شل کردووە . چونکە نووسیومە : سەفوەت « تەفسیری قورئان »ی هەیە .

خەلّکینە خراپم کردووە ، لیستەی ناوی کتێبە چاپ نەکراوەکانی سەفوەتم بلاّوکردۆتەوە ؟ بۆئەوەی ئەمانەش وەك هەندێکی تریان نەفەوتێن . ئایا باسی ئەوەی کە سەفوەت تەفسیری قورئانی کردووە . ( جلّەوی سۆزو نەگونجان ) شل کردنە ؟ . ئای لە ویژدان و مەوزووعیەت .

بەلێ سەفوەت ئەو دوو تەفسیرەی هەیە کە لە سەرەتای دیوانەکەدا باسم کردوون و ( گوایا ) نی یە . پاش چاپی دیوانەکە چەند بەشێکی تری تەفسیرەکەیم دۆزی یەوە کە ناوی ( چرای ڕێی بینین )ی لێناوە . ڕەنگە مودەعی و مونەفیز ئەمجارە لێم بێتە وەلاّم و بلێ : ئەی بۆ تائێستا باسی ئەمەیانت نەکردووە ، بەلێ ئەمەیانم پاش چاپی دیوانەکە دەستکەوت . لای کەسێك بوو کە وەکو مونەفیزی ووتارو کەسانی تر ( شتی لای خۆیان و خەلّك ناکەن بەژێر خۆلّەوە ) .

هەرچی ئەوەش کە ئەڵێ : «تەنیا دەنگی هەیەو ڕەنگی نی یە » . با بفەرموێ پیشانی بدەم ـ خۆ ئەگەر ( دیڤلۆپ )ی هەموویم پێ بڵاوبکرایەوە ئەوە چاپی ئاسانترە . ئەگەر ئەوانەی ئەم هێرشە نارەوایەیان ڕێکخستووە زۆریان پێخۆشە چاپ بکرێ ، خۆ ئێستا دەستیان ئەڕوا ، لە من ئامادەکردن و لەوان چاپ .

مونەفیزی ووتارو مامۆستاکانی هەر بۆئەوەی ڕێی بڵاوکردنەوەم لێبگرن یەکسەر ئەڵێن :

« لە لایەکیترەوە ئەوەی بەلامەوە سەیرە کە ئایا ئەم پێداگرتنەی دکتۆر لەمەر تەفسیرو ئەم بابەتانەدا تا چەند خزمەتی فیکری خۆی ئەکەن و گورئەدەنە بەر ڕەوتی مێژووی کۆمەلایەتی چۆن لەگەڵ فیکری خۆیدا جووتیان ئەکات » .

جارێ نازانم هەر ئەوەندەی نووسیبێتم سەفوەت تەفسیری قورئانی کردووە ئەمە پێداگرتنە ( لەمەڕ تەفسیرو ئەم بابەتانە ) ؟ پاشان با تەواو خەم دایانبگرێ ، بمێنم چاپکردنی هەموو بەرهەمی ئەو بنەماڵەیە بە ئەرکی سەرشانی خۆم ئەزانم ، منیش فریایان نەکەوم کەسیوامان هەیە پاش من چاپیان بکەن . ئەمەش هەمووی وەك ( سامان )و وەك ڕەنگدانەوەی بیری موسوڵمانی لەناو کورددا بەشێکن لە سامانی نەتەوەیی ( تراث )و بڵاوکردنەوەیان تەواو لەگەڵ بیری پێشکەوتنخوازانەی مندا جووتەو بە هەموو بارێکدا تێگەیشتنی کورد لە هەموو سەرچاوەکانی بیر گورئەدەن بە ڕەوتی مێژووی کۆمەلایەتی . جا ئەگەر ئەمە زیان بدات لە پرۆپۆگاندەی هەندێك لەوانەی سەنگەری مونەفیزی ووتار ئەوە نازانم .

ماڵت ئاوا کاکە کاوس . ئەمە ( ڕق )و ( تامپۆن )ەکەی تۆ ئەسەلمێنێ[٩]

٦ ـ سەفوەت و زمانی بێگانە :

کە نووسین لە ڕق و کینەوە هەڵقولا ئەم چەشنە ووتانەی لێ پەیدا ئەبێ ـ مونەفیزی ووتار نووسیویە :

« دکتۆر لە پێشەکی یەکەیدا چەندان قسەی تێهەلکێش کردووەو هیچکامیان توخنی واقیع ناکەون و تێناگەم ـ ڕاستە تێناگا ـ ع . م . ر ـ ئەم دەستەهەڵبەستانە چی ئەگەیەنن و لە چکانیاوێك دەم تەڕئەکەن ؟ ئەوەتا لە ( ل ٩ )دا جارێك بە ئینگلیزی زان و لە ( ل ٣٣ )دا وتویەتی کە هات و چۆی ( ڕەفیق حیلمی ) کردووە بۆ مەسەلەی فەرەنسی زانین ... هتد » .

جا هەر ڕق و کینە نی یە ، بەڵکو بە بەرچاوی خەڵکەوە ڕاستی هەڵگێڕانەوەشە بەرامبەر بەو قسانە . بزانن من ووتومە « ئینگلیزی زان » بوو یا ( بە فەرەنسی دوواوە ) یا ووتوومە :

« لە سەرەتای سی یەکاندا ویستبووی ئینگلیزی فێر بێت .هاوڕێ یەکی موعەلیمی دەستی دابووە فێرکردنی . بەڵام زۆر خەڵك و بەتایبەتی هەموو مەلاکان لێی کەوتبوونە هەراو کتێبی ئینگلیزی هاتنە مزگەوتیان بە کافری دانابوو . بەناچاری وازیان پێ لێ هێنابوو ... » .

یا ووتومە :

« ... لەناو نەخۆشخانەکەدا چووبووە ناو دەورەیەکی فەڕەنسی خوێندنەوە کە لەوێ سازدرابوو . کە هاتیشەوە وورده وورده بە فەڕەنسی دەدواو کۆمەڵێك کتێب و فەرهەنگی لەگەڵ خۆیدا هێنابۆوە » .

کەواتە دەستدانە ئینگلیزی خوێندن و زوو وازلێ هێنانی زۆر جیایە لەگەڵ « ئینگلیزی زان »ی و وورده وورده بە فەڕەنسی دووان و هێنانەوەی چەند کۆمەڵێك کتێب و فەرهەنگ لەگەڵ خۆداو ( یەكجار ) ( لەسەر ڕێوە لادانە ) لای مامۆستا ڕەفیق حیلمی و داوای یارمەتی لێکردن بۆ مەسەلەی فەڕەنسی زانین و چوونە دەورەیەکی فەڕەنسیی ناو خەستەخانە کە تەنیا

تیپ و ژمارەو سەرەتای تێدا فێرئەبێ جیان لەگەڵ فەرەنسی زانینن و لادانی سەرەڕێی یەکجاریش جیایە لەگەڵ ( هاتوچۆ ) کردن .

بەڕاستی عەرەب ڕاستیان ووتووە کە ووتویانە : ئەگەر شەرمت نەکرد چیئەکەی بیکە . ئەوەتا بە بەرچاومانەوە قسەکانم هەموو هەڵگێڕراوەنەتەوەو گۆڤارەکەش ئەوەندەی ئەرك نەداوەتە بەر خۆی ئەم دوو نووسینە بەراورد بکاو هیچ نەبێ ( درۆ ) بڵاونەکاتەوە . لەگەڵ ئەوەشدا چەند قسەم دەربارەی ئەم مەسەلەیە هەیە :

أ ـ من بۆ باسی زمان زانین ئەم نموونانەم نەهێناوەتەوە بەڵکو تەنیا مەبەسم لە عەقلیەتی‌کراوەی سەفوەت بوو ، کە بۆ ئەوانەی ئەیناسن شایەتیی زۆر لەمە زیاتری بۆئەدەن . ئەگەر مەسەلە زمان زانین بێت ، ئەوا لە نووسینەکانیدا دیارە کە « کوردیو عەرەبیو فارسیو تورکیی » باش زانیوە . کەچی ئەوەتا کەسیوا هەیە کوردیش باش نازانن چ‌ڕای زمانیتر ، کەچی بەم‌شێوە نارەوایە خۆیان فڕی ئەدەنە مەیدانی ئەدەبەوە .

ب ـ من باسی ژیانی کەسێك ئەکەم کە لە هەموو کەس زیاتری ئەناسم . هەرچەندە مامۆستا ناکام ( ماڵی ئاوا ) ئەیەوێ بۆ ڕاستی ووتن ئەوە دەرخا کە ئەو لە ئێمەش باشتری ناسیوە . لێرەدا دەمێنێتەوە سەر ویژدانی خەڵكو بڕیاردان بەسەر ڕاستگۆیی منو کەسانی وەك مامۆستا سوجادیو مامۆستا ناکامو زۆرکەسیتردا بەرامبەر بە لەخۆیەوە بەدرۆ خستنەوەمان لەلایەن مونەفیزی ووتارو هاوەڵانو پاڵپێوەنەرانی‌یەوە . ئەمەش هەر مێژووی ژیانو کۆڵنەدانو فیداکاری بۆ گەلو ووڵات ڕاستیان ئەسەلمێنێ .

ج ـ ئەو چوونەی لای مامۆستا ڕەفیق حیلمی پاش هاتنەوەی بوو لە لوبنان . بەڵام لەمەولا لەبەرچاوی کاڵو زمانی پاراوی مونەفیزی ووتار کە ئاویشمان خواردەوە ئەبێ جامێ ئاو بۆ ئەو یا بۆ کاکی بەدری بنێرین .

ئەڵێم : مامۆستای ئینگلیزی‌یەکەی نەماوە لەبەرئەوە ناوی نابەم . بەڵام مامۆستا بەکر مستەفا سالم‌و دوکتۆر موحسین جەمالەدین ماون ( پیاوی هاوشانی خۆیان ئەیانناسن )و هەردووکیان لەودەورەیەدا لەگەڵی بوون .

زۆر گاڵتەجاری‌یەکاکی بەدری ، عەرەب ووتەتی : « هــزلت وربّ الكعبة .. » بەڵام ئەوە کتێبی ( فەڕەنسی ) فێربوونەکەی ( سەفوەت )و بە کوردی‌و بە خەتی خۆی ووشە نووسینەکانی . دیارە کە ئەمەش کتێبی

---



*il a été corrigé. Farid est occu-pé. Jamil corrige sa page.*

*151 153 155 157 159 161*

## 4me Leçon.

### Consonnes composées

**Ch.** cha, cho, che, chi, chu, ché, chè, chê.

**Gn.** gna, gné, gno, gni, gnu, gné, gnè.

Cygne, vache, vigne, chute, signe, cheval, chasse, digne, charge, pêche, ligne, hache, chopine, chose, mèche, fichu, huche, signal, règne, signé, signature.

---

من نی‌یە . چونکە هاوەڵ خوێندنەکانم ئەزانن کە ئێمە ( مادام البصیر ) لە کتێبێکی‌تردا فەرەنسیی پێ‌ئەووتین ، خۆیشی ماوە دیارە ئێستا پەیامنێرتان هەیە با بچێ لێی بپرسێ . ئەوەش وێنەیەکی ئەو دەورەیە . ئەوەشتان لەبیرنەچی ، من ئەڵێم فەرەنسیم خوێندووە ، با نەمکا بە فەرەنسی‌زان .

40

affamé. parricide. étoffe. Hippolyte. La canne de papa est forte. L'abbé a donné l'accolade. Le garde a été attaqué sur le passage. La pomme est mûre. partage-la avec ce camarade. Une bulle du pape. Un accostage difficile. Une colonne toscane. L'acte a été annulé par un arrêté de police. Hippolyte arrive du village. il va à l'école, il apporte sa littérature arabe. L'immortalité de l'âme est sûre. La nappe est mise, le père arrive. il est affamé. Il apporte, il arrive.il ramasse une pomme.

Hippolyte arrive du village

*Ludovic a lu avec difficulté.*

د ـ وەك ووتم : دەستدانە فێربوونی زمانو فێربوونی سەرەتای زمانو ووردە ووردە قسەکردن جیاوازە لەگەڵ ( زمان زانین ) کە ئەمەش بۆ کەسێکی وەکو ( سەفوەت ) زۆر نیيە . بەڵام وادیارە مونەفیزی ووتار لەخۆیەوە سەیری ئەم دوو مەفهوومە جیاوازە ئەکا .ئەوەتا کەسێك بە واتای هاوەڵەکانی سێ ساڵ لە بەکەلۆریادا لە ئینگلیزیدا دەرنەچووەو ووردە ووردە بە هیچ زمانێکیش نازانی قسە بکا ( نەك ئینگلیزی )و موعەلیمێکی سەرنەکەوتووی سەرەتایی یە ( بە واتای سەرپەرشتیکەرەکان ) ، کەچی بە زۆر سواری سەری ئینگلیزی بووەو بەخاترانە دەرسی ناوەندی ئەڵێتەوەو باسی ئەدەبی ئینگلیزی ئەنووسیّو مەلزەمەی قاچاغ بەزۆر بە قوتابیان ئەفرۆشیو کتێبی زانایی پێ ڕاستئەکاتەوە ... هتد . ئەمەش هەر زەمانە !

## ٧ ـ دیسان ڕاستی هەڵگێڕانەوە :

من ووتوومە ڕەفیق حیلمی سەفوەتی زۆر خۆشدەویستو بە شاعیری باشیشی ئەزانی .

دیارە ئەمە ئەنجامی تێکەڵیی تەواوە لەگەڵ مامۆستا ڕەفیق حیلمیدا کە وا ئەزانم کوڕو کچەکانی شایەتی ئەوەن ، کە لە ساڵی ١٩٥٣ بەدوواوە من یەکێك بووم لە هەرە نزیکەکانی ، ئەگەر لە هەموشیان نزیکتری نەبووبم . زۆر جەمسەری کۆششی ئەدەبیو سیاسیی ئەو سەردەمانە لە بەردەمی مامۆستادا ئەیکردم بە قوتابی ئەو . زۆر ڕۆژو گەلێك شەو پێکەوە دائەنیشتین . ڕای بەرامبەر بە زۆر مەسەلەو زۆر کەس ئاگادارم ! . جێی متمانەی بووم . لێرەدا مەبەس میحرابی مامۆستای مەزن ڕەفیق حیلمی نییە . بەڵکو مەبەس ئەوەیە کەسێك شەرمنەکا درۆ بە ناوی ئەویشەوە بکات ، ئەمە چەندی بە چەند ؟

نەئەبوو چاوێك بە دوو لاپەڕەدا بخشێننەوە ، ئەوسا درۆ بڵاوبکەنەوە ؟

بەڵێ من لە باسی پێوەندیی سەفوەت و ڕەفیق حیلمیدا ئیشارەتم بۆ لاپەڕەی ٦ی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیی ڕەفیق حیلمی کردووە . بەڵام با بزانین مونەفیزی ووتار ڕاستیی ئەو لاپەڕەیەی چۆن هەڵگێڕاوەتەوە کە ئەڵێ :

« لە ڕاستیدا نووسەر ـ مەبەسی ڕەفیق حیلمی‌یە ( ع . م . ر ) ـ لە سەرەتای ئەو کتێبەیدا کە ساڵی ١٩٥٦ چاپی کردووە بەرگی دووەمینی لەوە دواوە کە نەتەوەی کورد شاعیری زۆرەو بێجگە لەو شاعیرانەی لە کتێبەکەدا باسکراون شاعیرانی‌تریش هەن و کۆمەڵێکی ڕیزکردووە وەکوو مارف خەزنەدارو مەنگوڕی و تۆفیق ووردی و هەوری و سەفوەت » ... هتد . دە توخوا بۆ بینینی ڕاستی هەڵگێڕانەوەو گۆڕینی ڕاو قسەی کەڵە پیاوێکی وەکو ڕەفیق حیلمی بزانن ڕەفیق حیلمی بەوچەشنەی نووسیوەو هەر ناوی ئەوانەی بردووە یا ڕەفیق حیلمی نووسیویە :

« ... بەڵکو هەر لە ناوچەکانی سلیمانی و کەرکووك و هەولێرا ئەوەندە شاعیر هەڵکەوتووە کە تەنیا ناوەکانیان نامیلکەییکی لێ ئەنوسرێتەوە ، لەناو ئەمانەدا ئەوانەی بەرەحمەت‌چوون ، وەکو : نالی و مەحوی و هجری و شێخ‌ڕەزاو مەولەوی و شوکری و مصباح و تایەربەگ و مەلا محمدی کویی و ڕەشیدی قادر ئاغاو ملا عبداللە ( مفتی پێنچوین ) و ئەختەرو صافی و لە تازەکان ئەوانەی کە شوکر ماون ، وەکو : سەعید فەوزی و شێخ مصطفی‌ی شێخ سەلام و قانع و ئەحمەدی شێخ غەنی و مەلا ئەسعەدی مەحوی و ڕۆژبەیانی و هەردی و توفیق ووردی و برایم ئەحمەدو هەژار ( عزیز موکریانی ) و مصطفی صفوت و کانی و معروف خەزنەدارو هەوری و مەدهۆش و بێ‌باك و فایق زیوەرو مەنگوڕی و شارەزووری و آورەحمان بەگی

نفوس‌و .. هەموو شاعـرن‌و هەنـدێکیان لەوانـەن کە ئـەشێ بەتـایبەتی ناميلکەییکیان دەربارە بنووسرێتەوە ... »[١٠] .

جا ئەوەی ڕەفیق حیلمی نووسیویە لەکوێ‌و ئەمەی مونەفیزی ووتار هەڵیگێڕاوەتەوە لەکوێ ؟ ئایا سەفوەتی هەر لەگەڵ ئەو چەند کەسـەدا ناوبردووە کە مونەفیزی ووتار بە شاعیریان نازانی‌و ناویانی هەڵبژاردووە یا ناوی کۆمەڵێ کەڵە شاعیریشی بردووە .

هـەرچی پرسیـاری مونـەفیزی ووتـارە دەربارەی نـاوی معروف خزنەدار ئەوە مونەفیزی ووتار باش‌ئەزانێ کە ناوبراو خۆی سەرپەرشتیی چاپی ئەو کتێبەی بۆ ڕەفیق حیلمی کـردو خۆی نـاوی خۆی خستبـووە ڕیزەوەو هاتوچۆکەرانی لای مامۆستا بەشیرباشیان لەبیرە کە ڕەفیق حیلمی زۆری پێ ناخۆش بوو ئەشزانن بۆچ نـەیئەویست لەسـەر ئەمـە لەگەڵی تێـک‌بدات ، ئـەو سەودەمـە ناوبـراو هێشتا کـاروبـاری ڕەفیق حیلمیی ڕائەپەڕاندو هێشتا بـەتەواوی نـەکەوتبـووە ئیش بۆ تـۆفیق وەهبی‌و بۆ یادگاری هەندی هەوڵدانی شیعر نووسینی ئەو سەردەمەشی دەرفەتی‌تری هەیە . وابزانم مونەفیزی ووتار ئەم قسانەی ئەویست .

## ٨ ـ مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵ‌و دیسان قسە هەڵگێڕانەوە :

مونەفیزی ووتار دەربارەی مزگەوتی باشچـاوەش یا حـاجی مەلا ڕەسووڵ دیسانـەوە کەوتـۆتە قسـە هەڵگێـڕانەوە . ئـەوەتا ئـەنووسێ : ( سەبارەت بەو مزگەوتەی کە باوکی پێش نوێژی تیا ئەکردو کاروبـاری ئیسلامی تیا بەڕێوەئەبرد لەوە دواوە کە لە بنەڕەتدا مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵی باپیریتی‌و بەهەڵە بە مزگەوتی ( بـاشچاوەش نـاوی زڕاوە ) . کـەچی کە سـەیری نـووسینەکـەی من بکەویت وامنـەوتووە ، بـەڵکـو

نووسیومه : « ... یەکێکە لەو مزگەوتانەی لە سەرەتای دروستکردنی سلیمانییەوە دروستکراون . حاجی مەلا ڕەسووڵ هەر لەوکاتەوە کە بووە بە مەلا لەو مزگەوتە بووە . لەبەرئەوە لەناو خەڵکدا بە ناوی ئەوەوە ناسرابوو . پاش دروستبوونی حوکومەتی عیراق هەر خۆی لە کاروباری ڕەسمیدا بە ناوی ئەوکەسەوە کە دروستی کردووە ناوی ناوە مزگەوتی ( باشچاوەش ) ( ئەم باشچاوەشە باپیری ئەورەحمان ئاغای ئەحمەد پاشایە ) ... » .

جا ئەمجارەش بەراوردی ئەو دوو قسەیە بکەن و بزانن چۆن قسەکەمی هەڵگێڕاوەتەوە .

أ ـ من ووتوومە چونکە حاجی مەلا ڕەسووڵ یەکەم مەلای بووە ، یا یەکەم مەلایەتیی ئەو لەوێدا بووە ، لەناو خەڵکدا بە ناوی ئەوەوە بەناوبانگە ( نەمووتووە ناوی زڕاوە ) .

ب ـ نەمووتووە بە هەڵە بە ناوی ( باشچاوەش )ەوە ناونراوە : بەڵکو خۆم ئەڵێم ( سەفوەت بە ناوی ئەوکەسەوە کە بینای کردووە لە ڕەسمیاتدا ناوی ناوە مزگەوتی باشچاوەش ) .

ج ـ ئەوانەی شارەزای مزگەوتی سلیمانین ئەزانن کە زوربەی ئەو مزگەوتانە دوو یا سێ ناویان هەیە . هەندێکیان ناوی مەلاکانیانن ، هەندێ گەڕەك ، هەندێ دامەزرێنەرو زۆر جار هەموو ئەمانەش لە ئەوقاندا بە ناوێکیترەوە تەسجیلکراون . هەر بۆنموونە :

مزگەوتی بابان = مزگەوتی گەورە = مزگەوتی کاك ئەحمەد

مزگەوتی شێخ جەلال = مزگەوتی قەزازەکان = مزگەوتی حاجی عەزیزی خەیات

مزگەوتی بابەعەلی = مزگەوتی شێخ عەبدورەحمانی ئەبووبەکر

مزگەوتی هەلاجەکان = مزگەوتی شێخ عەبدورەحمانی عازەبانی

مزگەوتی دوودەرگا = مزگەوتی شێخ عەبدوڵڵای هەولێری

مزگەوتی شێخەلی = مزگەوتی مەلا ئەمینی مام ڕۆستەم

مزگەوتی بن تەبەق = مزگەوتی عیرفان

د ـ سەیر ئەوەیە من خۆم ئەڵێم سەفوەت خۆی لە ڕەسمیاتدا ناوی مزگەوتەکەی بە ( باشچاوەش ) تەسجیلکردو وەك خەڵك ئەوساو ئێستا ناوی ئەبەن ناوی نەنا مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵو هەر خۆم لە دیوانەکەدا قەسیدەی بوردی‌یەکەیم بلاوکردۆتەوە کە سەفوەت خۆی نووسیویە مودەڕیسی مزگەوتی باشچاوەش . کەچی مونەفیزی ووتار خەڵك بە گێل ئەزانی قسەکەی خۆمم بە ناوی ڕاستکردنەوەوە پێ ئەفرۆشێتەوە .

هـ ـ نازانم بۆ هەر بۆ ناوی ئەم مزگەوتە ، خۆی لە نووسینەکانی مامۆستا سوجادی‌و مامۆستا ناکامو ( علماؤنا )ی مامۆستای مودەڕیس گێل کردووە .

و ـ هەرچی قسە نارەواکانی ئەم بەندەی نووسینەکەیەتی ئەوە عەرەب ئەڵێ : وكل إناءٍ بالذى فيه ينضح .

ز ـ دیارە مونەفیزی ووتارو مامۆستا نەشارەزاکانی نازانن مزگەوتی هەڵەبجە بە ناوی ( مەلیك )ی عیراقەوە ناونراوە مزگەوتی ( پاشا ) تا بکرێ بە ( کۆماری ) ئەگینا وەك زۆر مزگەوتی بەغدا ناوی ئەگۆڕرا . بەڵکو مزگەوتی وەسمان‌پاشای جافە کە هەر ناوی ئەمێنێ .

## ٩ ـ سەفوەت‌و ئاشتیخوازی :

مونەفیزی ووتار نووسیویە

« لەم پێشەکی‌یەدا بە بێ‌تێڕامان‌و هەست بە لێپرسینەوە کۆمەڵێ قسەی شەن‌وکەو نەکراوی خستووەتە بەرچاو ، لە ( ل ١٢ )دا ئەڵێ ( لە ساڵانی پەنجادا هەندێك‌جار لەگەڵ ئاشتی خوازاندا ناوو ئیمزای هەبوو ،

الجلي ۝ حضرة علي ۝ وهو من به فخرني الشيخ حسن البصري ۝ وهو بلا فخ تم ۝ الشيخ حبيب العجمي ۝ وهو مولاي ۝ الشيخ داود الطائي ۝ وهو من حب

بقلبي مألوف ۝ الكرخي المعروف بمعروف ۝ وهو بكائي وقطبي ۝ الشيخ السري السقطي ۝ وهو باستادي ۝ الشيخ جنيد البغدادي ۝ وهو من منه لي فتوح

الشيخ ابي بكر الشبلي ۝ وهو محيي البال الرميم ۝ الشيخ ابي فضل التميمي ۝ وهو مجلسي في طريقته عوج ولا عوج ۝ الطرطوسي المكني بابي الفرج ۝ وهو

وهو محبوب الملك الباري ۝ الشيخ علي الهكاري ۝ وهو مجذوبي ۝ الشيخ سعيد المخزومي ۝ وهو بقطب الرباني ۝ الشيخ عبد القادر الجيلاني ۝ وهو محبوب

المالك الخلاق ۝ الشيخ عبد الرزاق ۝ وهو مصاحب الحبل المتين ۝ الشيخ محيي الدين ۝ وهو من رجائه عند ربه غير مردود ۝ حضرة الشيخ داود ۝

وهو ممروج دين المصطفى في الله ۝ الشيخ محمد غريب الله ۝ وهو مصاحب الفلاح الشيخ عبد الفتاح السياح ۝ وهو من ظل كرمه علينا دائم ۝

الشيخ محمد قاسم ۝ وهو من شد الطرائق ۝ الشيخ محمد صادق ۝ وهو فخري ۝ الشيخ حسين البصري ۝ وهو من يقبل رجائي ۝ الشيخ احمد الاحصائي ۝

وهو بغوث الثاني ۝ الشيخ اسماعيل الولياني ۝ وهو من بفضله نعم ۝ الشيخ علي الدين وليم ۝ وهو بلبني النور البهي ۝ الشيخ معروف النوديهي ۝

وهو والدي الامجد ۝ وانا الحقير السيد كاكا احمد جعلت ولي المقبول ۝ في الدين والدنيا ۝ الملا رسول الدهليزي المجازي

في الحقيقة ۝ وخليفتي في الطريقة والشريعة ۝ كما اجازني وصيرني خليفة الوالد الماجد اللهم وفقه على الطاعة والعبادة وترويج

الدين المنيف ۝ والتدريس في العلم الشريف ۝ والوعظ ونصيحة المسلمين والامر بالمعروف ۝ والنهي عن المنكر ۝ بحرمة نحو ربيعة ومضر ۝

آمين بجاه النبي اجمعين والسلام على من اتبع الهدى واجتنب الردى ۝

المجاز المبايع ذو الاذ...
فيهما السيد احمد النو...
...

بەڵێ من دەیان ووتاری عەبدولواحید نووریم وێنە گرتەوەو دامِ بە کچەکانی کە ئێستا بە کۆششی کاك مەحموود تۆفیق خەریکی ئامادەکردنی بەرهەمەکانین . ئەمەش مونەفیزی ووتار بە درۆ ئەخاتەوە کە جارێك یەخەی نووسەر ئەکرەم قەرەداخیو کوچکردوو ا. ب. هەوریی گرتووە کە گوایا عەبدولواحید نووری ( ... لەڕاستیدا سەرجەم ووتارەکانی لە پەنجەکانی هەردوو دەست تێپەڕ ناکەن ... )[11] . ئەوکاتەی کە بەرهەمی تەواوی عەبدولواحید نووری دەرئەچێ ، ئەوسا ڕاستییو تەواویی ژمارەکانی ئەم بیبلۆگرافیا چییەتان بۆ دەرئەکەوێ . بەڵام سەیر ئەوەیە کە هەموو ئەرکی مونەفیزی ووتار لە مەیدانی نووسینی کوردیدا ئەوەیە کە نهێنگرانە بە چەند ساڵێك جارێك بێتە ناوەوەو بە ناوی بیبلۆگرافیا زانینەوە یەخەی نووسەرێکی ناسراو بگرێ بۆئەوەی ناوی پێ دەربکا ، کەچی ئەم نووسینەی یا لە ترسی ئەوەی لەو ڕۆژنامەیەدا ناوی دەرئەچێ یا بۆ مەبەسێکیتر بە ناوی خۆیەوە نەنووسیوەو بە ناوی ( خوێندەوارێك )ەوە

بڕوانە :

گۆڤاری ( الطريق ) . ژمارەی تشرینی دووەمی ۱۹۵۲ ( بیرووت ) .

ڕۆژنامەی : ئازادی ژمارەکانی تەمووزی ۱۹۵۹ .

ڕۆژنامەی اتحاد الشعب ژمارەکانی تەمووزی ۱۹۵۹ .

بۆ ووتە زۆر جوانەکانیشی هەر ئەڵێم : ( وكل إناءٍ بالذي فيه ينضح ) .

هەرچی دەربارەی شیعری ( سەفوەت )ە لە ( ژیان )و ( ژیانەوە )دا ... هتد من نەمنووسیوە لەوێدا شیعری هەیە ، بەڵکو نووسیومە ڕەنگە هەبێ . خۆ ئەگەر هەموو ئەو ژمارانەم دەستبکەوتایەو شیعری ئەوی تێدا بووایە دیارە لە دیوانەکەدا جێم ئەکردنەوە .

یەخەی ئەو دوو نووسەرەی گرتووە . بەلام ئاگادار بوون لە کاروباری ئەو ڕۆژنامەیە ئەم ڕاستی‌یەی خستە بەرچاوم .

کە باس باسی ( ژیانەوە )و ( ژیان )و ( ژین )ە ئەبێ بڵێم نە بۆ سەفوەتو نە بۆ عەبدولواحید نووری‌و نە بۆ ئەحمەد موختار جاف ژمارەی تەواوی هەموو ئەو ڕۆژنامانەم دەست نەکەوت ، دەبوو مونەفیزی ووتارو ماموستاکەی کە بە واتای خۆیان سەری کوێرەماریان لایە ، نەیشارنەوەو هەڵیان نەگرن بۆ پاش بڵاوکردنەوە ، هەر بۆ ئیعتیرازو بۆ ناوبردنێکیان .

هەرچی باسی « ئەنجامو سەقامگیری هەڵوێستو باوەڕو نیهادی دەروون »ی سەفوەتیشە ئەوا ( **كبرت كلمة تخرج من أفواههم** ) . ئەی کە ئیشارەتی ڕووداوێکی ڕۆژی ٩ ی حوزەیرانی ١٩٦٣م کردوووە ؛ بۆ خۆتان لێ لاداوە ، چونکە شایەتەکانی ئەو هەڵوێستە مەردانەیە زیندوون ، یا ناتانەوێ پشتی ئەو هەڵوێستانە بگرن کە ئازایانەو مەردانە پشت بە خەڵكو نەتەوەن . لێرەشدا قسە ئەدەمە دەست ویژدانو دەریاش وا بەئاسانی پیس نابێ .

## ١٠ ـ مونەفیزی ووتار بێ بناغە ، هەر بۆ هێرش‌بردن ئەنووسێ :

( بەڵکو لە ( ل ٣٥ )دا ئەوەی درکاندووە کە حاجی مەلا ڕەسوول جێ‌نشینی حاجی کاك ئەحمەد بووە ) . مونەفیز بۆ بەدرۆخستنەوەی منو حاجی مەلا ڕەسوولو کاك ئەحمەدیش ئەڵێ : ( بۆ ئەمەیان لێکۆڵینەوەیەکی فراوان ئامادەیە .. هتد ) . دیارە هەر لە ڕقی ئێمە دەبێتە تۆمارکەری شەجەرەی هەموو شێخانی تەریقەتیش . بەلام بۆئەوەی « خولی سێیەم » ناچار نەبێ جارێکی‌تر سەری خەڵك بەدرۆو دەلەسە

بیەشێنێو ( حاجی مەلا ڕەسووڵو حاجی کاك ئـەحمەد )یش لە قـەبر ڕاستنەکەنەوە ئەنووسم :

أ ـ من نەمنووسیوە ( جێنشین ) ، نووسیوومە ( خەلیفـە ) . بۆ کەسێکیش ئاگاداری کەمێك لە مێژوو و تەسەوف بێ ئەزانێ ئەم دوو شتە جیاوازن .

ب ـ ئەمە لە لاپەڕە ( ٣٥ )دا نی‌یە ، بەڵکو لە لاپـەڕە ( ٤ )و لە لاپەڕە ( ١٠ )و ل ( ٩٠ )دایەو لە هەر سێکیانا ( خەلیفە ) نووسراوە .

ج ـ مونەفیزی ووتار خۆی لەم سێ شوێنە گێلکردووەو هاتۆتە سەر لاپەڕە ( ٣٥ ) کە لەوێدا باسی ئەوە کراوە کە لە دوو غەزادا حاجی مەلا ڕەسووڵ بە جێگریی کاك ئەحمەد بەیداغی دایـەدەست شێخی نەمـر ، ئەوەی لەڕاستی ی ئەم مەسەلە مێژوویی‌یەو لە زمانی کوردی‌یا ئاگادار بێ ئەزانێ کە ئەم جێگری‌یە نە خەلیفەو نە جێنشین ناگریتەوە .

د ـ ئەگەر بچینەوە سەر ڕشتەی مرواریی مامۆستا سوجادی ئەوا نوکتەی دەربارەی غەزای شوعەیبەو ئەو بەیداخەو « مەلا چاوڕەشەکەی کاك ئەحمەد » تیایە .

هـ ـ هەر ئەو بەیداخە بوو حـاجی مەلا ڕەسـووڵ بردی‌یـە سەر بەلەدیەو بەیداخی ئینگلیزی لەوێ داگرتو ئەوی لەجێ‌دانا . دیارە ئینگلیز چی‌یەکان تازە حەق لە حاجی مەلا ڕەسووڵ ئەکەنەوە .

و ـ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لەمبـارەیەوە لە بـاسی حاجی مەلا ڕەسووڵدا نووسیویە :

« ... وانتسب الى حضرة السيد كاك احمد الشيخ قدس الله سرَّه العزيز . وسلك وتربى عنده فصار من المختصين وخليفة له في إقامة حلقات الذكر والتهليل والوعظ ، والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر ، ولا يخاف لومة لائم ، ويدخل المجتمعات والنوادي والمقاهي ويعظ أهلها ويزجرهم ويدعوهم الى الله تعالى وطاعته ، بحيث صار شعاره الوعظ والارشاد الى الصراط المستقيم . وسكن إماماً في مسجد بارچاوش ، ويصرف وقته ليل نهار كما ذكرنا . وترأس جماً غفيراً من المسلمين سنة ألف وثلاثمائة وخمس وثلاثين هجرية ،فتوجه من السليمانية الى ناحية ( بيستان ) في حدود ( بانه ) لمواجهة الروس القيصري والجهاد في سبيل الله . فجزاه الله خيراً ... »[١٢] .

یادگاریکی دلسوزیە بو زانای بەناوبانگ،
خوشەویستی کورد ماموستای بەرزمان
جەنابی مستر ئەدموندس

معروف خزنەدار

معروف خـــزنه دار

المدرسة الاعدادية المركزية
بغداد : العراق ، ٢٢/٨/١٩٥٦م

MA'RUF KHIZNADAR
Central Secondary School
Baghdad.

Rec. 10.8.56.

ئەوەی کە دیاریشە ئەوەیە کە حاجی مەلا ڕەسووڵ مەلا ئەحمەدو مەلا مەحمسودی کوڕی لەو شەڕەدا لەگەڵدا بووە . جا نازانم مونەفیزی ووتار لە ڕقی من بێ ، یا لە ڕقی قەیسەر ڕوخێنەران بێ ، هەقی ئەمەش لە حاجی مەلا ڕەسووڵ بکاتەوە .

٢ ليس لي علم ان اقتدار كنت لدى حضرته مقبولا ودليلا

اسمع المسمع لانه جعلني رسوله ثم كنت دائما في خدمته ملازما

بصحبته ولما كنت عنده محبوبا وبقربه الدخيلة منسوبا

واتخذني ترجمانا وخليلا وعلى قرائنه مكتوبا بانه مرشدا

ودليلا اذ ذنت ان اكتب اوراقا في كراماته موضحا

فيها بعض خوارق عاداته فان كراماته وان لا تحد

وخوارق عاداته لا تعد لكن مد يدل على التعدد فانه قليل

يدل على الكثرة وقطرة تجعل ماء بحر واضحا فاما ان يكون

حاليا واما ان يكون ماليا اعني اجماله واذكر اوائل

وانبه احواله ليكون معلوما عند من بعد عنه ولم يقتبس

نورا منه لو استضاء به يكون حاضر المجلس ولو اعتقد

ز ـ ئەگەر کاکی بەدری بەڵگەی تری ئەوێ ، ئەوە دوو وێنە :

یەکەم : خەت و مۆری کاك ئەحمەد کە حاجی مەلا ڕەسووڵی کردووە بە خەلیفە .

دووەم : لاپەڕەیەك لە دەستنووسی کتێبی « تنزيه الروح » کە حاجی مەلا ڕەسووڵ ساڵی ١٣٠٦ ، واتە ساڵێك پاش مردنی کاك ئەحمەد نووسیویەتی و باسی ئەو پێوەندی یەی تێدایە .

سێیەم : لە دەستنووسەوە بۆ بەڵگەی مادی . حەزم ئەکرد مونەفیز یا هاندەرانی بێن و لە لای نەوەکانی حاجی مەلا ڕەسووڵ ، لە یادگارەکانی کاك ئەحمەد « داری عەساکەی » ببینن کە شێخ ڕەزا خۆی کردووە بە قوربانی ئەوو « سۆڵ و سیواکی » ، یا کەواو گوللەبەندی ببینن . یا تەواوی دەستنووسی « مكتوبات »ەکەی کە ئێستا بە ئەمانەت لە خزمەت مامۆستا مەلا عەبدولکەریمدان بۆ سوود لێ بینینیان لە پرۆژەی وەرگێڕانەکەیدا . خۆ ئێمەش ئیدیعای دروست کردنی ( متحف الآباء والأجداد )مان نەکردووە تا بڵێین لەوێدا بیبینن . ئامادەشین ( سۆڵ و سیواکەکە )شیان پێشکەش بکەین .

وابزانم لەمە زیاتر درێژە پێدانی ناوێ .

١١ ـ پاش ئەوەی حەوت لاپەڕەی بەم ووردە باسە لاوەکی و ناڕاستانە ڕەش کردەوە ، ئەوسا دێتە سەر شیعرو تەنیا ٣ ـ ٤ دێڕ دەگرێ و دەیکا بە کەرەسەی باسی ( ئەدەب و رەخنە ... هتد ) ، ئەویش دوور لە باسی ئیستاتیك و هونەری شیعر ، هەموو ئەم باسەشی چوار لاپەڕەی چاپی گۆڤارەکەیە کە لە ڕاستیدا هەر قەوارەی دوو لاپەڕەیە ، چونکە کۆمەڵێ دێڕە شیعری خەڵکی بە بۆڵدی گەورە تێ فرێدراوە[١٣] .

أ ـ مونەفیزی ووتار ئەڵێ : کورد لەم چەشنە شاعیرانەی زۆرە ، بەڵام کەسی وایان نەبووە دیوانیان چاپ بکا . لەبەر ئەوە منیش بەوە تاوانبار

ئەکا کە پێش دیوانی خەڵکی دیوانی سەفوەتم چاپکردووە . بەم مەنتیقە ئەبێ من دیوانی هەموو ئەوکەسانە چاپبکەم کە لە باوکم بە شاعیرتریان دەزانم ، یا نووسینی هەموو ئەوانە چاپبکەم کە لە خۆم و باوکم بە نووسەرتریان ئەزانم ئەوسا بێمە سەر ئەم بەرهەمانە . وابزانم ئەگەر مونەفیزی ووتارو هاوەلە دەستدارەکانی چاپخانەیەك و دەستگایەکی بڵاوکردنەوەشم بۆ بڕەخسێنن ئەم کارە نە بە من نە بە کەسی تر ناکرێ . کە ڕق و کینە بوونە هۆی نووسین ڕەخنەو بیری وا نامەنتیقیش زۆر ئەبن .

پاشان ئەڵێ : گوایە من « لەو ڕاستی یە ڕووم وەرچەرخاندووەو بیروڕای سەیرم دەربارەی شیعرەکان هەڵڕشتووە . لە کام ڕاستی لامداوە ؟ لەوەی کە کورد شاعیری لە « سەفوەت » چاکتری هەیە ؟ کوا لەکوێدا ؟ ئەی لە پێشەکیی دیوانەکەیدا نەبێ لەکوێدا ئەو بایەخەم بە شیعری « سەفوەت » داوە ؟ یا لەوەی کە کورد ئەدەبیاتی هەیەو شاعیری هەیە ؟ ئایا منیش وەك یەکێك لە مامۆستاو قارەمانەکانی مونەفیزی ووتار بەڕەسمی بۆ زانستگام نووسیوە کورد ئەدەبیاتی نی یە تا مێژووی ئەدەبیاتی هەبێ ؟ یا من بەزۆر بەسەر زانستگایەکمدا سەپاند کە ماددەی ( مێژووی ئەدەبی کوردی ) لە بەرنامەی زانستگادا لادەن و ناوی بنێن « هونەرەکانی ئەدەب » ؟ دیارە ئەمە کاری من نی یە ؟ ئەی با لێیان بپرسم ، ئایا زوربەی تەمەنی خۆم بۆچی سەرف کردووە ؟ ئایا ژیانی شەخسیی خۆم نەبەستووە بە ئەدەبیاتی کوردی یەوە ؟ بۆنە مدەتوانی وەك هەندێ لە قارەمانەکانی مونەفیزی ووتار ببمە پسپۆڕی ئەدەبیاتی دراوسێ و بێگانە ؟ یا زمانی تر . ئەی چەندین کتێب دەربارەی شاعیرانی کوردو ئەدەبیاتی کوردی و سەدان ووتاری نووسراوو بەڕادیۆ ووتراو چین ؟ ئەمانە هەموو ڕوو وەرچەرخاندنن لەو ڕاستییە ؟ کەمێ ویژدان !!

ئینجا هەر لەبەرئەوەی لە پێشەکیی دیوانی شاعیرێکدا باسی تەنیا

الحمد لمن ليس له بداية ولا نهاية ٥ وهو الذي ارشدنا الى طريقة الحق والهداية ٥ وجعل احبائه المشايخ المرشدين ٥ وصيّر اعداءه آ...

والصلاة والسلام على من ختم به النبوة والرسالة ٥ ومنّ عليه بان يستقام به موازين القسط والعدالة ٥ وعلى آله وصحبه الذين ببذلهم

جهدهم لاحت شمس الدين والشرع ٥ وبايادي هممهم تاسست عمارة الزهد والورع ٥ وبعد فيا اخي ان الحقيقة شبيهة بالبحور

والشريعة فيها كالسفينة تدور ٥ وطائفة وهم الاولياء يستخرجون في تلك البحر الدرر واللآلي ٥ وبنوة هم العلماء يخدمون هذه السفن

في الايام والليالي ٥ ينجون بسبيلهم من سلك ٥ ومن خالفهم يغرق ويهلك ٥ فليس غير منكر وجاحد ٥ يعلم ان الطريقة مع الشريعة

كلاهما في الحقيقة واحد ٥ وان اشتهر يا اخي الرائق ٥ ان الطرق الى الله بعدد انفاس الخلائق ٥ لكن اعلموا بان اختلاف سلوك الطرائق للمريدين

حق كاختلاف لمذاهب الائمة الاربعة المجتهدين ٥ كل طريقة معقولة لدى العلماء الباطنية والظاهرية ٥ لا سيما طريقتنا المشهورة بالقادرية ٥

واعلموا بان طريقتنا هذه مبنية على الكتاب والسنة والشرع ٥ ومؤيد بالزهد والتقوى والورع ٥ ومرشح بادامة الصيام وتقليل

المنام والكلام والطعام وبمداومة الذكر والفكر و[illegible] بالسخاء ٥ وبذل الندا وكف الجفاء ٥ وحمل الاذى وترك اللذات ٥ والتوقف

عن العثرات ٥ وترك خصومة المسلمين الا في امور الدين ٥ والانس بالفقراء ٥ وقلة مخالطة الاغنياء ٥ وترك مصاحبة الاشقياء ٥ وبالتخلق

بصفات مرضية ٥ ودفع امراض قلبية ٥ ولبس الثوب على الصفاء ورمي الدنيا خلف القفا ٥ والسلوك على طريقة المصطفى

کول نابێ ) . ئینجا ئەوەش بزانن کە یەکتری بینینی منو جەواهیری تاقە جارو دە جارو سەد جاریش نی یە ، تا دەرفەتم بینیبێو تەنیا باسی باوکمم بۆ کردبێ . ئەوە موناسەبەتی ئەو شیعرە بـووەو ڕێك لە بـاسی ( الی بائعـة السمك في پراغ )ی جـەواهیری یـەوە باسی هـات . هەر بـەهۆی منـەوە جەواهیریو سەفوەت لە میهرەجانی ڕەسافیی ساڵی ١٩٥٩دا یەکیان دیو ئەوەش کەرەسەی نووسینەوەی لاپەڕەیەکی ڕەنگینی یادگارە . لێرەشدا دیسـان گلەیی ئەچێتـەوە سەر نـووسەرانی گـۆڤارەکـە ، چونکـە ئـەم ڕاستی یانە ئەزانن و بەزۆر ئەیانەوێ بە بڵاوکردنەوەی ئەم درۆیانە لە نرخی خەڵك کەمبکەنەوە .

دیـارە مونـەفیزی ووتـار هیچ کـۆڕو یەکتـر بینینی نووسـەرانو شاعیرانو دیداری تایبەتیانی نەدیووە . لەبەرئەمـە وائەزانێمن بـاڵیۆز بوومو وەك نوێنەری یەکێتیی نووسەران ئەم شاعیری گەورە یا ئەوم دیوەو هەقیشی داوە بە خۆی کە پرۆگرامی ئەو یەکتر بینینەم بۆ دابنێ .

وائەزانم لە سوودی گشتی بەدەر نی یە کە پێی بڵێم : لەگەڵ نـازم حیکمەتدا هەر باسی قـەدری جانو گـۆرانمان کـرد . ئەحمـەد فائیـزی پاکستانیو پابلۆ نیرۆدا گۆرانیان بە هۆی شیعرو ئەندامێتیی ئەنجوومەنی ئاشتیی جیهانەوە ئەناسی ، لەبەرئەوە هەر باسی ئەومان کرد .

جـارێك سـارتەرو دی بـۆڤوارم لەگـەڵ وەرگێـڕێکی ڕووسیـدا لە کۆنگرەیەکی ئاشتیدا دی . بەڵام ئەو سەردەمە عەبەسیو وجوودی یەکانی هاوەڵی مونەفیزی ووتار لە جیهانی ئەدەبدا نەبوون تا باسیان بکەم . بە باشی باسی وەرگێڕانی ( الشهداء يعودون هذا الاسبوع )م بۆ ئـەلتاهـیر وەتاریش دوو ساڵ لەمەوبەر کردووە .

کێیترت ئەوێ ؟

« یەشار کەمال ، ڕەسووڵ هەمزاتۆڤ ، سلیمان ڕەحیمۆڤ ، میرزا

( زانا دانایه ، دانا توانایه )

# مێژوی
# ئەدەبی کوردی

## میژو ، ئەدەب ، زانیاری

« تاریخي کورد لەبەرەبەیانی مێژوی ئادەمیزادەوە ، باوەرری بێگانە بەرامبەر بەکورد ..

مێژوی ئەدەب ، ئەدەبی زمان ، داهاتنی ئەدەب لە عالەمدا ، ئەدەبی‌کورد ، چیرۆکی‌کورد ، پەندی پێشینان ، شاعرە هەرە گەورەکانی‌کورد ، ئەدەبی رۆژنامە ..

ئەدەب لە رۆژەلانی‌کۆندا ، بەراوردی ئەدەبی کوردی لەگەڵ ئەدەبی میسری‌کۆن ، فارسي‌کۆن ، چینی کۆن ، هیندی کۆن ، عیبری‌کۆن ، یۆنان ، رۆمان .. »

علاء الدین سجادی

چاپی دووەم

١٣٩٠هـ - ١٩٧١م

لە چاپدانەوەی بەدەست خاوەنیەتی

چاپخانەی معارف - بەغداد

ئێوەو ( الواقعية في الأدب الكردي ) . کامەیە پلار . یا ئەوەی نووسیومە ( نـازانستی‌یانـە )یە وەك مـونەفیـزی ووتـار نـووسیـویـە ؟ بـەڵێ من نووسیومە :

[ ... بـەلاَم وەسفـکردنی سـروشتی کوردستـان لای مـەولەوی ( ١٨٠٦ ـ ١٨٨٢ ز ) « سـروشتێکی کـوردانـەی هـەیـە . » لەمـەدا ( بـەتـایبـەتی لەمـەدا ) بلیمـەت مـەولەوی‌یـە ، لە هـەمـوو دێـرێکی هەڵبەستەکانیا بەردێك لە هەڵدێرە سەختەکانی کوردستانی ( لووتکـەی ئاتەشگا ) بە بازرەقە بەستن تل‌ئەبێتەوە ، شـەپۆلێـك لە قەڵبـەزەکەی سەرچاوەی زەڵم خۆی ئەدا بەسەر تاوێری بەرداو ئەبێ بە لافاوی کەفی شـیر ، پەڵە هـەڵمێکی دووکەلاَوی لە سـەهۆڵەکـانی گۆمی زرێبـار بەرز ئـەبێتەوەو لەگـەڵ هەنـاسەی سـاردی مەولەوی خـۆی بەری ئـاسمان ئەگرن »[١٧] .

مەولەوی جگە لەوەی یـەکەم شـاعیری کـوردە توانیـویەتی بـە شێـوەیەکی داهێنـەرانە وێنـەیـەکی زینـدووی سـروشتی کـوردستـان بنەخشێنێ ، لە ژیانی تاڵ و تفتی خەڵکیش وورد دەبێتەوەو تانەو تەشەرلە زەمانە دەداو ئازارو ئەشکەنجەی ئادەمیزاد ئاوێتەی سـروشتی ڕەنگین دەکا ، وەك بیەوێ جوانیی سروشت و ژیانی ئادەمیزاد هاوتای یەکتـری بکا .

« معدومی غفلت تا چەندو پـەی چی
گـۆش‌دەر وە ناڵەی سحـری نـەیچی »[١٨]

بەلاَم کە هەست بە زۆرداری و زوڵم و ستەمی داگیرکەرو ژیانی پڕلە کوێرەوەریی دەکـا ، پێ‌وشوێنی « خـانی »و هەنـدێ شاعیـری ترمـان

هەڵناگرێ ، بەڵکو بانگی نووری خوایی پاکی پیغەمبەر ئەکا کە لە کوردستان هەڵبێ و ڕزگاری بکا :

## بریقەش دەرۆ جە کۆی کوردستان
## ڕسگار بین جە دەست نادان وەئاسان[19] ][20]

جا بۆچی مەولەوی ڕێی خانیی نەگرتووە ؟ ئەوە پلار نی‌یە ، بەڵکو ئەمە لێکدانەوەیە. هەر شاعیرەو هەرکەسە ڕێبازی خۆی هەیەو نەك مەولەوی بەڵکو کەس لە ڕۆژی خۆیدا ڕێگەی خانیی نەگرتووە . خۆئەمەش پلار نی‌یە لە هەمووکەس . وابزانم مونەفیزی ووتار لە ژیان و لە مەیدانی ڕەخنەدا هەر لە پلارو شەڕەقسە تێ‌ئەگات و هەرئەوە فێرکراوە . لەبەرئەوە خۆی لەوە نادات کە من لە شوێنی‌تردا نووسیومە : « ... وەك خانی لووتکەی کرمانجیی ژووروو و نوقتەی هاتنە خوارەوەی بوو ، هەروەها مەولەویش لووتکەی شیعری هەورامی و نوقتەی هاتنە خوارەوەیەتی . »[21] .

یا بۆ خۆی لەوە لائەدات کە لە موحازەرەیەکدا لەدەرەوەو لە یەکێ لە زانستگا دیارەکانی ئەوروپادا بەم‌چەشنە باسی مەولەویم کردووە کە ووتومە :

« ... مەولەوی عەبدولرەحیم ( ١٢٢١ هـ ـ ١٣٠٠ هـ ) یەکێکە لەو شاعیرانە کە دەبێ لە باسی ئەدەبیاتی سۆفیدا بەشی تایبەتیی بۆ تەرخان کرێ و لە هەموو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا جێگەیەکی گەورەو شایانی بۆ دابنرێ و لە چەند مەیدانێکدا بە سەرئامەد دانرێ و لە شیعری تەڕو پڕسۆزی بدوێین .

مەولەوی لە پاڵ ئەو شیعرانەیدا کە بە گیانێکی سۆفیانە نووسراون بە

کتێبی بە شیعر نووسراوی « العقیدة المرضیـة »و « الفضیلة »و چەنـد کتێبی‌تر لە ڕیزی دانەرانی ئەدەبی فێرکردن ( تەعلیمی )ی سۆفیـزمدا جێی خۆی کردۆتەوە . »[٢٢]

وابزانم زۆر کەس ئاگادارن کـە بە دەیـان ووتاری ڕادیـۆ شوێنی مەولەویم بە بەرزی نیشانداوە . بەڵام دیارە هەندێ کەس لەڕاستی هەموو ڕاستی‌یەك کەڕیش‌و لاڵیشن . سەیر ئەوەشە کە هەر لەسەر ئەم چـەند دێڕەی باسی مەولەوی نووسەرێك بـە بادینی لێم هـاتبووە جـواب‌و شتی سەیری نووسیبوو ، کە گوایە چۆن من مەولەوی لە خانی بـە شاعیـرتر ئەزانم لە وەسفی سروشتدا .ئەی بەڕەحمەت‌بی مەلای مەزبوورە .

١٣ ـ پاش کۆمەڵێ ووشەو ڕستەی‌تر کە جاران « نووسەری کورد » نەیئەگرتنە خۆی‌و پاش گێرەشێوێنی‌و کای کۆن بەباکردنێکی بەناهەق ، دێتە سەر ئـەو چەنـد دێڕە شیعـرەی هەر ئـەوە کەرەسـەی ئیعتیرازو دەس‌مایەی مەیدانی لێدوانی دیوانەکەیە لایان .

أ ـ گوایە دێڕێکی سەفوەت لە دێڕێکی حەمدی‌یەوە وەرگیراوە . بەڵێ « سەفوەت » ئەڵێ :

**خەیاڵی عەشقی هێند گەرمە لە سەرما**
**لە زستـانـا نی‌یـە بـاکم لە ســەرمـا**

( حەمدی )یش ئەڵێ :

**خەیاڵی عــەشقی ڕووتە وا لە سـەرما**
**بـە ڕووتی بۆیـە نیمە بـاکی سەرمـا**

بەڵێ لەیەك‌ئەچن ، بەڵام جیاوازیشن . با بڵێـین چونکـە حەمـدی شاعیرترە ، سەفوەت لەوی وەرگرتووە . بەڵام « سەفوەت » دە دێڕی لێ

دروستکردووه که هیچیان له شەش دێڕەکەی تری حەمدی ناچن . ئەم وەرگرتنەش لەناو شاعیراندا ( اقتباس وتضمین )ی پێئەڵێن‌و سەدان نموونەش بۆ ئەم مەسەلەیە هەیە . ڕەنگە دەیان قەسیدەی عەرەبی هەبێ کە بە « یا لیل الصب متی غده » دەست پێئەکەن ، کە ئەمیش ( معارضة )ی پێئەڵێن ـ دیارە ئەمە لە چەشنە موعارەزە هەمیشەییەکانی مونەفیزی ووتار نییە . تەنیا ئەوەندە هەیە ئەگەر دێڕەکە بەتەواوی بەرهەمی شاعیرێکیتر بێت ، ئەوا لە خاڵبەندیی تازەدا دەیخەنە ناو دووکەوانەوە . بەڵام ئەمەی سەفوەت تەواو ئەوی حەمدی نییەو هیچ زیانیشی نییە دوو کەوانی بۆ دروستبکرێت . بەڵام دیارە مونەفیزی ووتار دوور لە جیهانی ئیبداع‌و ئیستاتیك ، شیعر هەر بە ژمارە لێكئەداتەوە .

ب ـ قەسیدەیەکی سەفوەت‌و ئەحمەدی کۆر :

سەفوەت قەسیدەیەکی هەیە بەم دێڕە دەست پێدەکات :

**دولبەرا تا کەی بناڵم دەمبەدەم هەر سوبح‌و شام**
**بۆچی ناپرسی لە حالم خۆشەویستی خۆش کەلام**

لە پەراوێزدا نووسیومە :

( دێڕی یەکەمی ئەم پارچەیەو هونەرە شیعرییەکەی چۆتەوە سەر پارچەیەکی ئەحمەدی کۆر کە بەم دێڕە دەست پێدەکات :

**دولبەرا دایم دەناڵم دەمبەدەم شام‌و سەحەر**
**جارێ ناپرسی لە حاڵم چاو عوقابی خۆش خەبەر )**

جا پاش ئەم ئەمانەت و ڕاستگۆیی و بۆچوونە ئەدەبی یە تەماشاکەن ڕق و کینەو بێ ئینسافی ئەمەشی چۆن هەڵگێڕاوەتەوە . مـونەفیـزی ووتار ئەنووسێ :

( کوت ومت ووشەو بیرو شێوەو ئاهەنگی سـەرجەم شیعـرەکە لە بەرهەمێکی « ئەحمەدی کـۆر »ەوە وەرگێڕاوە . هـەرچەنـدە دوکتۆر لە پەراوێزداو بۆ شوێنەونی ئیشارەتێکی بچووکی بۆ ئەم مەسەلەیە کردووەو بەڵام تەنها ئەوەی درکاندووە کە هونەرە شیعری یەکەی چووەتەوە سەر ( ئەحمەدی کور ) ـ قسەی مونەفیزی ووتار ئەواو ـ

ئەبی بەرامبەر بەمە چی بڵێم ؟ من دیوانم چاپکردووەو دیـراسەی هەموو شیعرو دێڕەکانم نەنووسیووە تا ١٠ لاپەڕە بۆ بەراورد بنووسم . ئەوەش ڕەنگە زیاد بێ ، چونکە هەر شاعیرێك ناوی ( دولبەر )ی هێنا ئەبێ لە ئەحمەدی کۆری وەرگرتبێ . ئەی ئەوانەی پێش ئەو ؟ یا هەر شاعیرێك کێشێکی بەکارهێنا یا هونەرێکی بەلاغیی وەك ( رد الصدر علی العجز )ی بەکارهێنا ئەبێ دزیبێتی . وابزانم من خۆم باسی ئەحمەدی کۆرم نەکردایە ئەو هەر ئاگای لێ نەئەبوو ئێستاش ئاگای لێ نی یە . بە هەموو حاڵ دوو قەسیدەکە ئەگەر لەیەك چوونیشیان تێدا بێ هەر جیان ، جا هەر لەبەرئەو لەیەك چوونە ئەبوو ئەمیان بڵاو نـەکرێتـەوە ؟ وابزانم کـەسێ کەمتـرین شارەزایی لە جیهانی شیعرو ڕەخنەی ئەدەبی و مێژووی ئەدەبدا هەبێ ئەم قسانە ناکات و کەسێك کەمێك ویژدانی هەبێ بـەرامبەر ڕاستگـویی ئاوا قسەی خۆمم پێ نافرۆشێتەوە .

ج ـ قەسیدەیەکی کۆنی سەفوەتی هێناوەو ئەڵێ :

( هەر دێڕەی بیرو زادەی شاعیرێکەو لەئەنجامدا ئەم شیعرەی لێ دروستبووە ) .

کەچی کە بە بەرچاوی کاکی ئاکرێ یەوە تەواو خۆی ئەگوشێ ، لە

( ١٨ ) نيوه دێڕ ( میسره‌ع ) ، ته‌نیا دوو ( میسره‌ع )ی دوو شاعیری‌تر ژێرکه‌وتووانه ئه‌هێنێته‌وه :

سه‌فوه‌ت له وه‌سفی شاری مووسڵدا ئه‌ڵێ :

**شه‌و ڕۆژه له‌به‌ر به‌رقی ئه‌له‌تریك‌و چراخان**

حه‌مدوون له وه‌سفی جه‌نگدا ووتووویه‌تی :

**شه‌و ڕۆژه له‌به‌ر به‌رقی قلیج‌و ڕم‌و سوننی**

باس‌و مه‌به‌س زۆر له‌یه‌ك‌دوورن . که‌واته هه‌ر شاعیرێ ووتی ( قژکاڵ ) ئه‌بێ له گۆرانی وه‌رگرتبێ . جا با وه‌ری بگرێ . بۆ ئه‌میشیان ئه‌وپه‌ڕه‌که‌ی له چاره‌که دێڕێکدا دوو که‌وان بۆ ( شه‌و ڕۆژه له‌به‌ر به‌رقی ) دائه‌نرێ‌و ئه‌میش ئاسایی‌یه .

نیو دێڕی دووه‌م ئه‌وه‌یه که سه‌فوه‌ت ئه‌ڵێ :

**ئه‌م گه‌ردنه بێ‌گه‌رده که وه‌ك جامی بلووره**

هه‌ردیش ئه‌ڵێ :

**ئه‌و گه‌ردنه بێ‌گه‌رده که وه‌ك ته‌ختی بلووره**

بۆ ئه‌مه‌یان کورد بدوێنه شه‌رعی خۆی ئه‌کات . مونه‌فیزی ووتار له په‌راویزدا نووسیوی‌یه قه‌سیده‌که‌ی هه‌ردی له ( ٢٤ ی ئابی ١٩٣٩ )دا

بڵاوکراوەتەوە . کەچی بەرامبەر بەوە لاڵە کە قەسیدەکەی سەفوەت وەك لە پەراوێزا ئیشارەتکراوە لە [ ٦ ی ( ربیع الاول )ی ١٣٤٥ی هیجری ، موسادیفی ١٩٢٦ی میلادیدا نووسراوە ] ( دیارە ئەمە کاتێکیشە کە نەمن لەدایك بوومو نە باوکم ژنی هێناوە ) .

بە هەمووحاڵ ئەگەر بەمچەشنە بە دیوانی شاعیراندا بگەڕێین ، بەتایبەتی ئەگەر بە دوو زمانی جیاوازیش بن ، ئەوا لە هەر دیوانەدا سەدەها تێبینیی وا ئەنووسرێ . یا ئەبێ « ئەدەبی بەراوردکاری » وباسی « کارتێکردن » لە فەرهەنگی مێژووی ئەدەبا نەهێڵین . هەر بۆ سوودی گشتیش دەڵێم ـ زۆر جار لە ناو دەروونەوە هەندێ شتی پەنگەوە خواردوو دێتە دەرەوە شاعیر وا ئەزانێ شیعری خۆیەتی بۆ ئەمەش لە کۆی یادگارا هەندێ نموونەم هەیە . بەلاّم ( کنگرو ماست بۆ وەعدەی خۆی ) .

د ـ چوارینێك هەیە ئەڵێ :

**بێخود ! شەو ئەگەر هەتا بڵێی تاریکە**
**ڕێگەیش بەخودا درێژو باریکە**
**کاروان هەموو باری کردو ڕۆیشتن تۆیش**
**خۆت گورجەوە کە کە ڕۆینت نزدیکە**

لە پەراوێزی ئەم چوارینەدا نووسیومە :

« ئەم چوارینە لە دیوانی بێخوددا بە ناوی بێخودەوە تۆمارکراوە ، بە نووسینەوەی چەند جارەی بە خەتی سەفوەت لەناو شیعرەکانی خۆیدا ، دیارە شیعری ئەمەو لە شێوەی گاڵتەدا بۆ بێخودی نووسیوە . کە لە شوێنیتری دیوانەکەدا ئەمچەشنە گاڵتەیە هەیە »[٢٤] .

بەلاّم مونەفیزی ووتار ئەمەیشی پێ فرۆشتــوومەتــەوە فەرمــانێکی شاهانەی بۆ دەرکردووم و ئەڵێ :

( بەپێی ئەو سەرچاوەو دەستنووسە دەوڵەمەندانەی کە ئێستە لە بــەردەستدان بــەرهەمی بێخــودەو لە جێی خۆیــدایەتی کــەبخرێتــەوە دیوانەکەی مەلا مەحموودی بێخودەوە ) .

بــەلاّم کام ســەرچاوەی دەوڵەمــەند ؟ ئــەی ئەگــەر ئەم هــەمــوو سەرچاوەو دەستنوسە دەوڵەمەندانەی لابوو بۆچی لە کاتی ئامادەکردنی دیوانی بێخوددا نەیدا بە کاکە ( شێرۆ )ی بــرازای یا بــە ئامــادەکەری دیوان ، یا بۆ کاتی کۆڕە فراوانەکەی کە لە سلیمانی بۆ بێخود گیرا نەهاتە گــوفتار ؟ جــارێ من باوەڕم بــە هیچ لەم ( ســەرچــاوەو دەستنــووســە دەوڵەمەندانــە )ی نی‌یە کــە پاش دەرچــوونی ئەم دیــوان و ئەو دیــوان دەیانکات بە کەرەسەی نهێنگری و ڕەخنە لە خەڵك گرتن ، کە هەر ئەمەش ئەزانێ و بەس ) پاشان دێمەوە سەر چوارینەکەو ئەڵێم : هیچ ڕێی تێ‌ناچێ بێخود بەم چەشنە گاڵتە لەگەڵ خۆی بکــا . بۆ پێــوەندیی کــەسانی وەك بێخودو سەفوەتیش ئەوە کاری کەســانی وەك مونــەفیزی ووتــار نی‌یە . لێرەشدا ئەبێ من بەوان بڵێم :

## مــووددەعــی وازی لە هــەق هــێــنــاوە
## شــایــەت بــۆ دیــفــاع هــەڵکــێــشــاوە

ئامادەکەرو پێشەکی نووسی دیوانی بێخود مامۆستا محەمەدی مەلا کــەریمەو خــۆی نووســەرەوەو سەرپــەرشتکەری زۆر لایــەنی دیــوانی ( سەفوەت )بوو و دەستنووسەکانی ( بێخود ) لای ئەون . هەروەك کاك عەبدوڕەحمانی موفتي ( شێرۆ ) ئاگاداری ئەم دوو دێڕەیە .

جا بەرامبەر بەم فەرمانەشی ، نازانم مونەفیزی ووتار هەر بەوەی چەند جارێك چۆتە حەمامی موفتی بووە بە واریسی بنەماڵەی بێخودو موفتیی چاوماری دێلێژەیی ؟ . بە هەمووحاڵ ئەو دوو دێڕە گاڵتە ئامێزە بۆکـوێ ئـەبات ببیـات . حەزئـەکـا بیکـات بـە بنـاعـەی ئـەو ( متحف الآبـاء والأجداد )ەی خۆیان کە دەمێکە نارەوا خەوی پێوە ئەبینن .

هـ ـ ئافەریم . لاتان‌وایە بۆ ئەم شەرفرۆشتنە مونەفیزی چـاکتان دۆزیوەتەوە . بۆئەوەی بەئاشکرا درۆ بکا ، ڕێك‌و ڕەوان خۆی لەوە کوێرو کەڕو لاڵ بکا کە لە بەردەمی‌یا نووسراوە ، هیچ شارەزای هونەری شیعرو شێـوەی دیوان ئـامادەکـردن نەبێ‌و خـۆی بۆ شکـانـدنی شـاعیـران‌و نووسەرانی شوێن‌پەنجە دیارو پیاوچاکان بە ( شۆڕە سواری ) هـەموو مەیدانێك بداتە قەڵەم .

ڕۆژێ لە کۆششی نیشتمانپەروەریدا بەشدار نەبووبێ‌و تاقە یـەك فیداکاریی بچووکیشی نەنواندبێ ، کەچی گاڵتە بە هەمووکەس‌و هەموو فیداکارو شەهیدو باوکە شەهیدێك بکا . با بێینەوە سەر باسەکەی :

من لەژێر دێڕە شیعرێکدا نووسیومە : ( ئەم تاکە بە خەتی شاعیر نـووسرابـۆوە. نیوەی یـەکەمی شیعـری مەحـوی‌یە ، نیـوەی دووەمم نەدۆزی‌یەوە . ڕەنگە هەر تێهەڵکێشی خۆی بێت ) .

دەبزانن ئەم ڕاستی‌ووتنەشی چۆن هەڵگێڕاوەتەوە کە ئـەڵێ : « بۆ نیوەکەی‌تری ووتراوە کـە تێهەڵکێشی ( سـەفوەت )ە » . جـا کە ووتـە نووسراوەکانی من ئاوا لەکاتێکدا بگـۆڕرین کە هێشتـا دیوانـەکە لەنـاو بازاڕدایە ، ئیتر چۆن ئەبێ باوەڕ بـەڕاستیی « بیبلۆگرافیـا »کانی‌تـری بکەین‌و چۆن ئەو هەموو قسانەی بەدەم ( مردوو )ەوە ئەیکـا بە ڕاست بزانرێن .

نەخێرڕاست ناکا ، نە ئەو نیو دێڕە شیعری نەجمەدین مەلایەو نە

ئەمیش لە ژیانی نەجمەدین مەلادا ( کە ساڵی ١٩٦٢ مردووە ) بە تەمەن و نە ئێستاش ئەو پلە ئەدەبی و کۆمەڵایەتی یەی هەیە کە چ نەجمەدین مەلاو چ کەسانی مردوویتریش کە بە درۆ شتیان ئەداتە پاڵ متمانەی پێ بکەن و باسی شیعرو ئەدەب و بیبلۆگرافیای بۆ بکەن .

بە هەموو حاڵێك ئەگەر ئەو نیو دێڕەش ئەبەن بۆ بناغەی ئەو ( متحف )ە پیرۆزیان بێت .

و ـ هەڵگێڕانەوەیەکیتر :

ئەڵێ : ( لە ( ل ١٤١ )یشدا چوارینێکی عەرەبی نیشاندراوەو خراوەتە خانەی شیعرەکانی ( سەفوەت )ەوە ، کەچی لە بەرهەمەکانی ( موفتیی زەهاوی )یە . دە سەیرکەن خوێندەواران ، من لەژێر ئەم چوارینەدا چیم نووسیوە :

« لەسەر بەرگی ( فصوص الحکم )ی ابن عربی بە خەتی خۆی نووسیویە ـ دڵنیا نیم ئەمەیان شیعری خۆیەتی یا نا ؟ » .

ئاشکرایە کە من نەمخستۆتە خانەی شیعری سەفوەتەوەو لێی دڵنیا نەبووم . ڕەنگە بشپرسن ئەی کەواتە بۆچ تۆمارت کردووە . بەڵێ بەگومانەوە تۆمارمکرد . دەیان دیوانیشتان بۆ دێنم کەقەسیدەو داستانی تەواوی تێدایە کە گومانیان لێ ئەکرێ شیعری ئەو خاوەن دیوانە بن . بەلام کە ساغ نەبنەوە بەگومانەوە تۆمار ئەکرێن . ئەوەتا تائێستا هەرچەند ساڵە جارێك ئێمە موناقەشەی ئەوە ئەکەین کە « کڵکۆی تازەی لەیل » شیعری حەماغای دەربەند فەقەرەیە یا ئەحمەد بەگی کۆماسی ؟ بۆ نێوان نالی و سالم و کوردیش گەلێك نموونە هەیە ـ بەلام کێ ئەڵێ ئەمە شیعری موفتیی زەهاوییە ؟ بە کام بەڵگە ؟ ئەوەتا بۆ شوێنەوونی ژمارە ( ٣١ )ی بۆ پەراوێز داناوەو پەراوێزەکەی نەنووسیوە . ئاوا فێڵ لە هەموو خوێنەران ئەکا .

ز ـ سەفوەت ئەڵێ :

**سوئالم کرد کە چین بەربوونەتە ئەو نەحسی قیرسچمە**
**دوو لفکەی دابەیەکدا کـاکە شێـخ قادر ووتـی : لچمـە**

مونەفیزی ووتار ئەڵێ: گوایە شێخ ڕەزا ووتوویەتی :

**تەعەجوب گرتمی لەوەی پەربوو لەو نەحسی قیرسچمە**
**دوو لێفـەی دابەیـەکدا خـاڵە مەحمـوود ووتی لچمـە**

**جارێ ئەم دوو دێڕە جیاوازییان لەنێواندا هەیە ، یەك نین ، هەر هیچ نەبێ لاسایی یەکن . بە هیچ جۆرێکیش ئەمەی دووەم لە سەلیقەی شاعیرانەی شێخ ڕەزا ناچێ ، شاشو لەنگە ، لە دیوانی شێخ ڕەزاشدا نییە . پاشان مونەفیز نە دەستنووسی لایەو نە هیچ . تەنیا ئـەو دوو دێڕەی بـە خەتی کـاك ئەحمـەد حسین دراوەتی . هەروەك هەموو شاعیـرێکیش بۆی هـەیە لەسـەر نەسـەقی ئەوە شیعری ناشێخ ڕەزایانە بنووسێ . بەڵام بۆ ئەمەشیـان ـ سەیـری بوختانو قسە هەڵگێڕانەوە ئەوەتا من لە پەراوێزدا نووسیومە :**
**« لە بەرگی فەرهەنگێکی ( المنجد )دا ئەم دێڕەش بـە خەتی شاعیر بە** نووسرابۆوە ، ڕەنگە ئەمیش هەر شیعری خۆی بێت چونکە لە دیوانیتردا نەمدیوە » .

کەچی مونەفیزی ووتار ئەم ڕاستیووتنو گومانەی منی کردووە بە یەقینێکی پڕ لە ئیفتیراو ئەڵێ :

یەقینێکی پڕ لە ئیفتیراو ئەڵێ :

( کەچی دوکتۆر شیعرێکی ئەم جوامێرەی بە پەڕو باڵەوە داڵقوت کردووەو خزاندوویەتێ دیوانەکەی باوکی‌یەوە ) .

بەڵێ هەمووی هەر قسەی خۆمە ، فێڵێکی پێ لە خوێنەران ئەکا ، چونکە لای‌وایە ئەوان ناچنەوە سەر دیوانەکە ئەوسا هەڵیئەگێڕێتەوەو پێمی ئەفرۆشێتەوە . هەرچی من ووتبێتم گومانی لێ ئەکەم ، بۆ هەڵخەڵەتاندنی خوێنەر پەراوێزو گومانەکانی منی قووت‌داوەو ئەوسا پێی‌ووتووم ئەمە شیعری ئەو نی‌یەو درۆیەکی دەربارەی ئارشیفی نەبوو و ناڕاستی خۆی کردووە .

هەرچی ترساندنیشە بە « تیغی زوبان »ی پاراوی مونەفیز خۆی یا شێخ ڕەزا ئەوە با ئەوانەی پێ بترسێنی کە شیعری لەنگ ئەدەنە پاڵ شێخ ڕەزا یا کەسانی « بێ‌دیرایەت »ی پێ‌بترسێنێ ، من لەوانە ناترسم چونکە من نەوەی ئەو ( موخلیس )ەم کە ووتوویەتی :

شیعرێ کە لە بۆ مەدحە نەتیجەی هەیە لیللا
خێرێ کە لە بۆ هەجوی تەماع بێ نی‌یە کەللا
(موخلیس) لە (ڕەزا) ڕازی‌یە ئەی جەمعی ئەخیللا
( بەم حاڵە پەرێشانەوە باز ئەشهەدو بیللا
شیعرت تەرەب ئەنگێزە ( ڕەزا ) شاعیری چاکی )

١٤ ـ پاش ئەمانە هەمووی مونەفیزی ووتار بە ( ١٤ ) دێڕ بە ناوی خۆی‌و هەموو هاوەڵو هاندەرەکانی‌یەوە دەرسی « ڕەخنەو فەلسەفەو پێشکەوتنخوازی »م پێ‌ئەدا . لە وەڵامی ئەمەدا ڕووئەکەمە نووسەرانو خوێندەوارانی بەئینسافو بەویژدانو داوایان لێ ئەکەم کە ئەوان پێ‌یان بڵێن :

**بەئەدەب بێرە حزوورو بە حەیـا سوجـدە بەرە**
**مەجلیسی دولبەرە قوربان ئـەمە مـەیخانـە نی‌یە**

## ١٥ ـ پەراوێزەکانی مونەفیز :

هاندەران‌و ڕێکخەرانی ووتار ئەم مونەفیزەیـان پڕ بـە مەبـەستی خۆیان هەڵبژاردووە . چونکە تـائێستا لە چـەند ( جنێـونامـە ) بەولاوە هیچی‌تری نەنووسیووە . جنیوەکانیشی بـۆ کەسـانی ناودارو نـاسراوی جیهانی تێکۆشان‌و ئیبداع بووە . ئەوەبوو یەخەی « کاکەی فەللاح‌و حسین عارف‌و محەمەدی مەلا کەریم ... هتد »ی گرتووە .

جارێك باسی بەرهەمێك کرا ، یەکێك لە مامۆستاکانی ئەم مونەفیزە ووتی : کامەتا چیی نووسیوە . بمدەنێ دەینێرم بۆ یەکێ لە پۆلیسەکانم لەسەری بنووسێ .

دکتور کاوس قەفتان‌و دکتۆر ئیحسان فوئاد پرسی‌یان : پۆلیسی چی ؟ پۆلیس‌و نووسین ؟ لە وەڵامدا ووتی :

ــ ئەی قابیلە پیاوێکی عەظیمی وەك ئەمن ، چەند پۆلیسی بۆنووسین نەبێ ؟ وەك : ( ... چەند ناوێکی ووت یەکەمیان ئەم مونەفیزی ووتارەی ئێستایە ) . دیارە مەبەسیشی لەوەوە نەهاتبوو کە مونەفیزی ووتـار پێی ووتبوو ـ زوربەی پۆلیسی شار لە شێخی بەرزنجە نی‌یە بەدرۆ لەناو خەڵکدا خۆی کردووە بە شێخ . بەڵکو مەبەسی ئەوەبوو کە هەندێ کەسی هەیە وەك پۆلیس بەریان‌ئەداتە گیانی نووسەرانی لێهـاتوو و خـۆی دوور لە پشت دۆرگەو دەریاوە بێ‌دەنـگ دائەنیشێ . پـاشان ووتی : بـەڵێ ئەو ـ واتـە پۆلیسەکەی ـ عادەتیە کە کەسێك سووك بکات لە پەراوێزدا ناوی ئەهێنێ .

جا خوێندەواری خۆشەویست : « ڕۆژ دێ‌و ڕۆژ دەڕوا » با بۆ ئەم

زەمانەی قەڵەم بەدەستی سەیری تێدا پەیدا کراوە ، ئاگاداری ئەم چەشنە عەقلیەتە بن ئەم سەرەتایەم گێڕایەوە . ئەوسا دێمە سەر پەراوێزە لا بەلاکانی مونەفیزی ووتارو هاندەرانی .

پ ٤ : ئەنووسێ : « دوکتۆر عیزەدین کە پێشەکی یان باسێکی ئەدەبی ئەنووسێ هێند باسی لاوەکی تێئەترنجێنێ کە زنجیرەی مەبەستی لە دەست ئەپچڕێو هیچ بایەخێك بە پرۆگرامی زانستی نادات . زوربەی ئەو پێشەکییانەی نووسیونی یان هێرشو پلارتێگرتنی بێهۆیە ، یان پیاهەڵدانی کەسانێکە کە مەبەستێتی ... » .

جا هەر لە ویژدانی دەستەی نووسەرانی خولی سێیەم ئەپرسم ، ئەگەر ئەو هەموو بەرهەمانەی من دوور بن لە ( پرۆگرامی زانستی )یەوە ، ئەبێ بەرهەمی کام زانای کورد لەسەر ئەو پرۆگرامە زانستییە بێ کە ئەوان ئەیانەوێ . بۆ باسی پرۆگرامی زانستی ئەبێ پسپۆڕو پیاوی خۆی بدۆزنەوە . کەمێك ڕێزی نووسینو زانستتان لا بێت . ( هەمووشت بە خۆیو خۆیش بەمانا ) . هەر ووتار بە دەستدروو دروستئەکەن . ئەوە ئەبێ لە سنووری عورفی ئەکادیمیا قسە بە خەڵك بڵێن ، نەك موعەلیمێکی نەشارەزای سەرنەکەوتووی سەرەتایی ، کە پێوەندیی بە جیهانی زانستەوە نییە بهێنن ، کەسێکی پێ بچووك بکەنەوە کە لەناو هەموو کورددا بەرزترین پلەی ئەکادیمیو زانستیو بەرزترین شەهادەتنامەی جیهانیی دراوەتێ . هیچ نەبێ تەجروبەیەکیترتان لە بەردەمدا بوو واتان لەگەڵ منیشدا بکردایە . عەرەب ئەڵێن : « لو ذات سوارٍ لطمتني » .

مونەفیزی ووتارو هاندەرانی دیسان ئاگاداری بەلاغەتو باسەکانی ( اسهاب وایجاز واستطراد ) نین ، تا بەوپێیە باسی ( لاوەکیو

تێترنجاندن ) بکەن . کە ئەم بریارە گەورەیەش بەسەر هەموو نووسینەکانی مندا دەدەن ، دیسان هەر بە بەرچاوی دوکتۆری ئاکرەیی یەوە خۆیان ئەگوشن و لە باسی هێمن و چەند دێڕێك بەولاوە کە من لە جێی خۆییدا و لە باسی قەلای دمدمدا لەسەر پێشەکی یەکی سەید محەمەد ئەمینی شێخو لئیسلامی ( هێمن )م نووسیووە هیچی تر دەرناپەڕێنن . (٢٥)(٣١)

●

پ ٥ : منیش زۆر سوپاسی کاك ڕەئووف بێگەردو سەرنج ڕاکێشان و ( ٦ ) بە ( ٩ ) کردن و شایەتی یەکانی ئەکەم .

پ ٦ : خەلك ئەبێ لای مونەفیزی ووتار ( هەلو ) بن ، بەلام ( عەبدولقادر ئەحمەد )ی ئامۆزام بە هەموو شکۆو قوربانی دان و دەردی سەری دیتن و سەر شۆڕنەکردنی یەوە ئەبێ سووك بکرێ . ئافەریم ( چەرخی بایەخ و وەفاداری ) .

عەبدولقادر شاعیرە . کەمی بلاوکردۆتەوە . بەلام شیعرەکانی لە گەلاوێژو ژین و هیوادا بە ناوی ( ع. ق )ەوە دەنگیان ئەدایەوە . پاش ڕاپەرینی ١٩٤٨ سالەهای سال لاوان ئەو شیعرو ئاوازەی ئەویان دەووتەوە کە یەکەمجار بە دەنگی خۆی بیسترا :

دلداری نەو گولێکم هوزاری سەرچلێکم
خۆزگە خوا بیکردایە دەستووری داهاتایە
بەرزی و نزمی نەمایە بەشەر وەك یەك بژیایە
ئەوسا زۆر بەئاسانی بێ ترسی بەرگ و نانی
بە خۆشی و کامەرانی ئەو نەوگولەم ئەهانی

گەلاوێژ ـ ١٩٤٨

---

● ( لێرەدا چەند لاپەڕەیەك دەربارەی شاعیری خوالێخۆشبوو « هێمن » هەبوو ، لەسەر داوای نووسەر خۆی لابرا ) . ن.ك

یا ئەڵێ :

**گەر ئەڵێی ئاشتیم ئەوێو بۆمبای ئەتۆم توونا بکەن**
**دەستو پێ بەستە ڕەوانەی نوگرە سەلمانت ئەکەن**

* * *

**گەر ئەڵێی بۆ هەڵبژاردەی نوێنەران سەربەست نەبێ**
**نیوەشەو ، چاو پڕ لە خەو ، ڕاپێچی شارانت ئەکەن**
**ژین ١٩٥٤**

یا :

**نەسرین با بسڕین ئەسرینی شادی**

**هیوا : ١٩٥٧**

کە لە کتێبێکی منیشدا یا لە کتێبێکی قوتابخانەدا جێی شیعری ئەو بۆتەوە هەر لەبەرئەوەیە کە لەو بابەتەی ئەو نەووتراوە . بۆنموونە ـ ئەو چەند دێڕەی لە باسی ئافرەتدا لە ( ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردی )دا باسی کراوە . ئەگەر لەڕووی ناوەڕۆکەوە ئەو چەشنە باسە نموونەی تری هەیە ، با ئەوەی ئەو لابدەین . بۆ ئەمەی ئێستاش مونەفیزی ووتار دیسان مەسەلەکەی زلکردووەو گۆڕیویەتی . جارێ ڕاست ناکات لە لاپەڕە ( ٢٣ )ی کتێبەکەدا هیچ شتێکی ئەو شاعیرەی تێدا نییە . لە لاپەڕە ١٣٤یشدا تەنیا چوارینێکی نووسراوەتەوە . ئەویش لە کۆتایی باسێکی ئەدەبیدا دەربارەی مانگ . کە بە شیعری بێکەس دەست پێکراوەو شیعری قەدری جان کراوە بەنموونە . دوو دێڕەکەش ئەمەیە :

وا مــانگی دەسـتکــرد ئــەسـووڕێتــەوە
کــاروان لە مــەڕیـخ ئــەگــەڕێتــەوە
تــۆ ئــەی میللەتـی لێقــەومـاوی کــورد
کــەی کــوتــی دەسـتــت ئــەڕەوێتــەوە

سەیر ئەوەیە کـە ناوی بێکـەس و قەدریجـان لای شیعرەکـانیان براوە . بۆئەم ناوی نەنووسراوەو هەر ووتراوە ـ شاعیرێکی کورد ئەلێ .لە پەراوێزیشدا وەك مونەفیزی ووتـار ئەلێ ـ هیـچ کورتـە مێژووی ژیـانی پڕشکۆشی نەنووسراوە ، بەڵکو تەنیا نووسراوە ـ عەبدولقادر ئەحمەد ( ع. ق )و هیچیتر .

جا خەڵکینە من ئەبوو چیبکەم . بەپێی پرۆگرامی کتێبی قوتابخانە پێمسپێررابوو پارچەیەکی ئەدەبی پەخشان دەربارەی ( گەیشتنە مانگ ) بنووسم . ئەم دوو دێڕە پڕماناو ناسکەشم لەپاڵ دوو پارچەیتری شیعری کـوردیدا دەربـارەی مانـگ لە بەردەستـدا بوو کـە بخرێنـە ناو پـارچە پەخشانەکەوە . جا ئەبوو هەر لەبەرئەوەی شیعری ئامـۆزایەکی خـۆمە بەوچەشنەش بێ ناوبـردنو بێ باسکـردنیش سوودی لێ نـەبینم . هەر بۆئەوەی ڕقو کینەی مونەفیزو مامۆستاو هەواڵەکانی نە یەتە جۆش ؟

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو عەبدولقادرەیئێوە وا سـووك باسیئـەکەن ، یـەکێکە لە کـوڵەکە بـەرزەکان . شـاعیر ، دەنـگخۆش ، مـەقـامزان ، تێکۆشەرێکە سالانی درێژی لە چاڵی بەندیخانەدا بردۆتەسـەر ، زوربەی بەندیخانەکانی وولاتی دیوە ، ژیـانی بە نـەبوونیو بـەسەربـەرزییەوە بردۆتەسەر ، قوربانیی داوە ، باوکی شەهیدێکی نەمرە . خوێندەوارێکە لە پلەی بەرزی زانینو زانستدا . بێئەوەی ( حەرفی مەکتەبیکی ) خوێندبێ شارەزایەکی باشی فیزیاو فەلسەفەیە کە لە هەندێ کـۆڕدا ئیشارەت بـۆ

ڕاکانی کراوە . ئێستاش لەم تەمەنیژوور ٦٥ ساڵییەدا لە جەرگەی ژیانی کوێرەوەریی خۆیدا شەوو ڕۆژی ٢٠٠ لاپەڕە زیاد لە هەموو بابەتێکی زانین ئەخوێنێتەوە . بەڕاستی هاوشانی هەمووکەسێك نی‌یەو شایانی نی‌یە ئاوا ناوی ببرێ .

ــ هەر لەم پەراوێزەدا مونەفیزی ووتار هەر بۆ تانووت دان لە من باسی کتێبی « زمان‌و ئەدەبی کوردی »ی پۆلی یەکەمی ناوەندیی ١٩٧١ ئەکات کە لەگەڵ دوکتۆر ئیحسان فوئادو سادق بەهادینا نووسیومانە .

بۆ تانووت‌دان لە من ستایشی « فس‌فس پاڵەوانێك »ی مەیدانی نووسین ئەکات کە کاتی خۆی شتێکی لەسەر ئەو کتێبە نووسی‌و بەشیر ووتەنی : « ئێمەش جوابمان‌دا »و ئیتر لە نووسین چۆوە . بۆ ڕاستی ئەنووسم :

ئەو تێ‌بینیانەی ئەو کابرایە نووسیبووی لە باسی « گۆرانی مەزن » دا نەبێ هیچی پێوەندیی بەو بەشانەوە نەبوو کە من نووسیبوومن . هەمووی دوو هاوەڵەکەمی ئەگرتەوە ، بەلام ئەوان بێ‌دەنگ بوون .

ــ لە باسی گۆرانی مەزنیشدا دیسان « جواب‌درا »و هەرچی ڕووبکاتە مانگی شەوی شیعری کوردی « گۆرانی مەزن » هەروەك ئەو جواب‌ئەدرێ‌و دیسان « کنگرو ماست بۆ وەعدەی خۆی » .

بەلام وابزانم نە قانزاجی مونەفیز نە هاوەڵ‌و مامۆستاکانێتی کە ئەوچەشنە نەشارەزاو نەخوێندەوارە بخەنە ناو سەنگەری خۆیانەوە .

چونکە ئەو کابرایە نە هیچی بۆ کورد کردووەو نە هیچی بۆ نووسیوە بەڵکو ئەم کارانەی بەرامبەر کردووە :

أ ـ پاش ئەوەی لە عیراقدا جەژنی میللیی کورد نەوروز بەڕەسمی بە جەژن ناسرا ، نووسی : نەوروز جەژنی کورد نی‌یەو کاوە کورد نی‌یەو

فارسە . هەر بۆئەوەی بۆ مەسلەحەت و خۆشی دان بەشۆڤێنی یە پان ئیرانستەکانی زەمانی شا هەستی کورد بریندار بکرێ .

ب - دەوری لە لابردنی مادەی « مێژووی ئەدەبی کوردی »وگۆڕینی بە « هونەرەکانی ئەدەب »دا هەبوو . ئێستاش لە بەرچاوی ( خوێش و بێگانە ) هاوار ئەکات کورد ئەدەبیاتی نی یە تا مێژووی ئەدەبی هەبێ . چەند تێکستێکی ئەدەبیی هەیە یا وەك تێکست بووترێتەوە !!

ج - هەر بۆ ئەم مەبەسە کتێبێکی « تێکستی ئەدەبی »ی نووسی . بە تێکستی خەڵکی قەوارەی زل کردبوو . شەرحێکی ساکاری کردبوو . لە ( ۹۰ ) شوێندا کوردیی بە لقی فارسی دابووە قەڵەم . بۆنموونە . خەوتن لە ( خبیدن )ەوە ، ڕۆیشتن لە « رفتن »ەوە ( ڕەسی لە رسیدن )ەوە هاتووە .. هتد . کۆمەڵێ پروپۆگاندەشی لەبەر خاتران بۆ جوولەکە تێدابوو . کتێبەکەی چوار خەبیر دیی .( د. مارف . د. ئیحسان . د. نەسرین - کە ئەو کاندیداتیان پێ ئەڵێ . هەروەها نووسەری ئەم چەند دێڕە کە لەبەر دوکتۆر ناوکەکە : ماڵیئاوا کاندیداتی ناو نەناوە ) . هیچ یەکێ لەم چوار خەبیرە دانی خێری بە کتێبەکەیدا نەناو جواب درا .

د - بە خەتی خۆی لەسەر ئێمەمانانی نووسیبوو : ( بابەتایەری شاعیری لوڕی فارسیان کردووە بەکورد ) . هەروەك بە خەتی خۆی بە حیسابی ئەوەی لای ئەو کوردی فارسی یە ، شانامەی فیردەوسیی بە سەرەتای ئەدەبی کوردی دانابوو . دەستم لە هەویرە هەر ئەوەندەم لەبیرە .

جا ئەمەیە ئەو قارەمانەی سەنگەرەکەتان . ئەوەی ئەو کردوویەتی کەسێکی دەرەوەی سەنگەری ئێوە بیکات چیتان پێ ئەکرد . ئەوەتا ڕاست و ڕەوان فارسچی ، دژی کورد ، بەڵام هەر لەبەرئەوەی دوو هێرش ئەکاتە سەر کەسانی وەك گۆران و عەلائەدین سوجادی و جگەرخوێن و من و دوو

قسه به بیرو باوەڕی پێشکەوتنخوازی دەڵێ - زۆرکەس لێی بێدەنگن و دەیانەوێ خەڵکی تریشی لێ بێدەنگ بکەن و مونەفیزی ووتارو مامۆستاکانی رێزی پێشەوەی سەنگەرەکەیانیان پێ بەخشیوە . نازانن سەنگەریان بەم چەشنە کەسە ئەشکێ - « وفي الهزيمة كالغزال » .

پ ٧ - مونەفیزی ووتار : « سەرنج و پێداچوونەوە »ی بەرامبەر بەو گۆشەی « ئەوانەی مردن و نامرن »ە هەیە کە من جاروبار لە ( هاوکاری )دا ئەیاننووسم . بەرامبەر بە کامیان ؟ کەڵە نووسەری وەك عەلادین سوجادی و جگەرخوین ؟ یا ئەحمەد شاڵی و ئەمینی میرزا کەریم یا قارەمانی گاڵتەوگەپی وەك خاڵە رەجەب ، یا لەتیف حامیدی جوانەمەرگ ، یا دڵسۆزو پیاوچاکی وەك حەمەی سەی برایم و حەمەی سەڵتە ؟ یا تێکۆشەری وەك عوسمان دانش و هاشم عەبدوڵلای هەولێری ، یا دوو حەمە ئەمینی زانا ؟ ئەمانەش هاوشانی هەمووکەس نین ، با « مردوو لە گۆڕدا رانەچڵەکێنن ، با زامی خاوەنانی ووشەی پاك و مەردانی رێی تێکۆشان نەکولێننەوە ، چونکە سزای ئەمەیان گەورەیە » .

پ ١٢ - « ریالیزم لە ئەدەبی کوردیدا » نامەی قوتابیەکی دوکتۆرا بوو ، چارەکە سەدەیەك لەمەوبەر نووسرا . بەلاّم بوو بە سەرچاوە ، چارەکە سەدەیەکە لێی وەرئەگیری و ئیشارەتی بۆ ئەکری . زۆری وەك ( مونەفیزی ووتار ) لێی ئەدزن و[**] ناوی نابەن . دەستنووسی پەسندکردنی زۆر زاناو نووسەری کوردو بێگانەم دەربارەیان لە بەردەستدایە . بۆنموونە « پرۆفیسۆر ، ئەکادیمیك حەمید ئەراسلی ، پرۆڤیسۆر میرزا ئاغای قولی زادە ، قەناتی کوردۆ ، رودینکۆ ، د. رەحیمی قازی ، د. عەلی گەلاوێژ . نەمر حەسەنی قزلجی . محی یەدین زەنگنە ... هتد » ئیتر ئەگەر کۆمەڵی هەڵەی چاپی تێدابێ یا چەند ژمارەیەك هەڵە

هەبێ ، لە بایەخی کتێبەکە کەم ناکاتەوە . شانازیش ئەکەم کە ئەو کتێبە ( تانەی سەرچاوی ) هەموو کۆنەپەرستانی کوردە .

پ ١٣ ـ هێرشێکی نارەوای ( لە پەراوێز )دا کردۆتە سەر حسێن عارف نووسەر . دۆستە نووسەرەکانم ئەزانن کە من زۆر گلەیی دۆستانەو رەخنەی ئایدیۆلۆژیم بەرامبەر بە حسێن عارف هەیە . بەلام لەگەڵ ئەوەشدا حسێن عارف نووسەرێکی گەورەو دیاردەیەکی گەورەیە لە رێرەوی ئەدەبیاتی کوردیدا ، رابەرێکی چیرۆك نووسینەو بۆ هەمووکەس نی یە بچێتە مەیدانی ئەوەوە .

لە ( چای شیرین )ەوە تائێستا لە بواری خۆیداو لەم مەلبەندەی ئێمەدا لە ریزی پێشەوەیەو تا ئێستا ئاواتی هەندێ کەس نەهاتۆتەدی کە بەرەی ئەو رابەری‌یەیان لەژێر پێ دەرهێنابێ .

پ ١٨ ـ بەڵێ ـ بەشی ئەدەبی ئەو شەش کتێبەی بۆ قوتابخانەی ناوەندو ئامادەیی دانراون من نووسیوومن . مامۆستایان : عەلادین سوجادی‌و فەرەیدوون عەلی ئەمین‌و د. ئەمین موتابچی کە ئەندامی لیژنە بوون لەگەڵما شەرەفی نووسینی هەموو بەشی ئەدەبەکەیان پێسپاردم‌و جێی رەزامەندیان بوو و بەشداریی نووسینی‌بەشی خوێندنەوەشم لەگەڵدا کردن .سەیر ئەوەیە مامۆستایەکی مونەفیزی ووتار لە کاتی خۆیدا تاقە رەخنەی ئەوە بوو کە ( بۆچ لەو لیژنەیەدا هێندەی هەر حەوت ئەندامەکەی‌تری هەموو بەشەکانی کتێبەکەم نووسیوەو لە پارەدا چون یەك بین ـ ئەمە قسەی ئەوە ) بەلام وادیارە پاش ١٣ ساڵ رەخنەی تازەیان پەیدا کردووە .

ئەو کتێبانە لە ساڵی ( ١٩٧٣ )وە تائێستا ئەخوێندرێن‌و جێی رەزامەندیی قوتابی‌و مامۆستایانی کوردن . چەند نەوەیان بە دەنگی

ڕەسەنی ئەدەبیاتی کوردی گۆش کرد . بەڵام ئەوەتا مونەفیزی ووتار ئەمیشی بەدڵ نی یەو ئەنووسی : « بەشی ئەدەبەکەیان پڕن لە هەڵەو کەموکووڕی » . دیارە هەقی بە سەربەشی ڕێزمانەوە نی یە ، چونکە من بەشداری نووسینی نەبووم . سەیری ڕق و کینە گەیشتۆتە کوێ ؟ ١٢ساڵە مامۆستاو قوتابی و نووسەران نووستوون و مونەفیزیش هەر لەخەودا بوو تازە هەستاوەو وەك کەڵەشێر بەم دەنگە ڕەوان و زوڵاڵەی ئاگادارمان ئەکاتەوە .

لێرەدا هەقم هەیە ئامۆژگاری یەکی گۆڤارەکە بکەم و بڵێم :

لەڕووی نووسین و ئەدەبەوە وا لیبرالی یانەو بێ هەست بە ئەنجام داوتانەتەبەری ، بەڵام کە کار گەیشتە مەیدانی زانست ، ئەبێ گوێ بدرێتە بایەخی زانستی .

لە زانستگادا کەسێك هەقی هەڵسەنگاندنی نووسەرێکی هەیە کە پلەی زانستیی ئەوی هەبێ یا زیاتر . بۆ ئەم چەشنە کتێبە وەزارەتی پەروەردە ڕا لە مامۆستایانی ئامادەیی قبوڵ ئەکات ، چونکە دەرسەکە ئەڵێنەوەو لە تەتبیقدا کەموکوڕیی دەبینن ( ئەویش تەتبیقی ) ، بەڵێ ڕەنگە بۆ ئێمە ـ ڕای نووسەرە گەورەکانمان وەرگیرێ ، با پلەی مامۆستاییشیان نەبێ . بەڵام بە هیچ داب و نەریتێك موعەلیمێکی سەرنەکەوتووی سەرەتایی بۆی نی یە لەسەر هەموو زاناو مامۆستایەك بنووسێ و ڕەخنەی هەڕەمەیی لە کتێبی هەموو پلەیەکی خوێندن بگرێ :

هەزار ڕەحمەت لە شێخ ڕەزا کە فەرموویە :

**کێ دیویەتی ئەی شێخ عەلی ماڵی خەزوور بۆ زاوا**
**تۆ لەکوێ و تەکیە لەکوێ ؟ بزنەگەڕی مەزناوا**

پ ١٩ ـ بەڵێ ـ وا قسەیەکی ڕاستی کرد . کتێبی « شیعرو ئەدەبیاتی کوردی »ی ڕەفیق حیلمی ساڵی ١٩٥٦ چاپکراوەو بەهەڵە لای من بووە بە ١٩٥٥ . ئەمە هەر ساڵی تەواوبوونی چاپی کتێبەکەیە کە لە ساڵی ١٩٤٣وە بەرەبەرە نووسراوە . بەڵام ئەمە بوو بە چەند جار مونەفیزی ووتار ئەم تاقە ساڵەی گرتووە بەدەمەوەو هەر ئەیجوێتەوەو دەینووسێتەوە ؟

پ ٢٣ : « دوکتۆر بە واتای خۆی لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٥ »ە . جارێ تەمەنی من ئەم هەڵچوون و داچوونەی ئەوی بۆچی یە ؟

بەڵێ من لە نفووسدا بە ١٩٣٤ نووسراوم . بەپێی نووسینێکی هیجری لە سەرەتای ١٩٣٥دا لەدایکبووم . چەند ئیشارەتی ترم لەلایە کە ١٩٣٤ یا سەرەتای ١٩٣٥ دەگرنەوە .. بە هەموو حاڵی من ئەوەندەم گوێنەداوەتێ ، ئەوەتا لەپێش ئەوەدا کە بە هیچ حسابیکیان نەگەیشتبوومە پەنجا ساڵ ، تەقاویت کرام و وای لێکرا کە بەداوای خۆم بووە . کاتی تەقاویتیش پلەی پرۆفیسۆرم دەمێك بوو هەبوو ، کە پرۆفیسۆری وولاتان لە ٨٠ ساڵیشدا هەر ئەمێنیتەوە .

لەبەرئەوەی لە ( تەسبیتی تەمەن )ی ڕەسمیی زانستگادا ساڵی ١٩٣٤ بوو بە ساڵی لەدایکبوونم و یادگارێکی پیرۆزی ئەوساڵەش هەر لەدڵمایە لەبەرئەوە ئێستا هەر ١٩٣٤ ئەنووسم . من دەربەس نیم ، کەواتە ئەم مونەفیزە بۆ کەوتۆتە گێچەڵ . خۆ قەرزداری نە شێخ نە مسکێنی بەرزنجە نیم ؟

**ئەنجام :**

بەڵێ وەك مونەفیزی ووتار لە سەرەتادا نووسیویە ، من خەریکم بەئیزنێ کە لە سوجادیی مامۆستامم وەرگرت ، مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەنووسم . وا دیارە لەو سەنگەرەی ئەوان ترسی ئەوەیان لیّنیشتووە کە کتێبیکی لە « ریالیزم لە ئەدەبی کوردی »و « ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی »و « ئەحمەدی خانی »و « شێخ ڕەزای تاڵەبانی »و « زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی »و « دەربارەی ڕۆژنامەگەریی کوردی » گەورەترو باشتر بکەوێتە دەستنەتەوەی کورد . لەبەرئەوە ئەم هەموو هێرشە چەند جەمسەری و یەك سەرچاوەییە ڕێكئەخریّ . تا پڕۆژەکە بووەستێننو بە کاری لاوەکی یەوە منیش و هاوڕێکەو ( هاوشان )ەکانی منیش خەریك کرێن . ئەگەر تائێستا لەم چەشنە حەنەحەبەشی یە لاوەکی یانە خۆم پاراستبیّو تائێستا وەلامی کەسم نەدابێتەوە . وا هەر ڕێمبدریّ بۆیان دێمە مەیدانەوە . هەر لەبەرئەوەی بێدەنگ بوون بە بیّدەسەلاتیو بیّوەلامی لێكنەدرێتەوە . بەتایبەتی کە هێرشە کە هەر نەکراوەتە سەر خۆم ، بەڵکو ئەکرێتە سەر بیروباوەڕو باوكو کەسو کارو بنەماڵەکەشم . هەر بۆ ئەوەش کە ئەم چەشنە پۆلیسانەی کۆڕی نووسین ئیتر شوولیّ لیّ هەڵنەکێشنو نووسەران لەڕێی خۆیان لانەدرێنو لە کاری بەکەڵکی خۆیان نەکرێن .

ڕەنگە هەندیّ کەس گلەیی ئەوەم لیّبکەن کە نووسینەکەم تەنیا بە مونەفیزەوە نەوەستاوە ، بەڵیّ چونکە لاموایە کە ئەمە تەنیا مونەفیزێکەو بەکارئەهێنریّو ئەوانە دوورو نزیك دەستیان لە ڕابوردووو ئێستای ( کار )ە نارەواکانی ئەم مونەفیزەدا هەیە . کەسێك کە باوكو باپیری ( بەرەحمەت بن ) کارێکی ئەوتۆیان بۆکورد نەکردووەو هەر دیار نین کیّن ، شتی زلیان بۆ دروستبکا . بەلام لە ڕقی من بوختان ، بۆ باوكو باپیرم ڕێکخریّ . لە ڕقی منِ تاوانی گەورە بدرێتە پاڵ کەسی گەورەی وەك مەولانا خالیدو خەڵکیش لیّی بێدەنگ بیّ ، ئەوە ئیتر یادی مەولاناو باووباپیر

ئەمجوولێنن و کورد ووتەنی : « لەجێی سندان قوزەلقورتە »و ئـەوانەی گلەیی ئەکەن با لەودەنگە ناسازانە بهاتنایە جواب .

دووا چرپەشم بۆ ئەم برایانی « بەدری و ئاکرەیی و شوان و شێـخ بزێنی و سندی و فندی »یەی خولی سێیەم ئەوەیە :

جاران دەسەلاتدارەکانی شار کە بیانویستایە زانایەك ، یا شاعیرێك ( بە خەیاڵی خۆیان ) سووك بکەن ، چەورەو دەمڕووتێکی[٣٣] شاریان لێ ڕائـەسپاردن لەســەر ڕێگە دوو جنێـویان پێ ئـەدان ، یا لێـیـان ئەدان ، نموونەی ئەمەشم لا زۆرە . لەم بارەیەوە ووتەیەکی پیـرەمێردی نـەمرم دێتەوە یاد کە نووسیویە :

« منیش دەردەکـەی حاجی مـەلا ڕەسووڵی مـەرحوومی واعیـزم لێقەوماوە . وەعزی دەخوێند ئەبوون بە دوژمنی . منیش هەڵساوم زبان و ژیانی قەومێك دەژێنم بە گاورم دەزانن »[٣٤] .

وا دیارە ئێستا ئەمچەشنە مونەفیزەمان لێ ڕاست ئەکەنەوە ، باشە هەر ئەوەندە لە خۆتان بپرسن : کەسێك هەموو نووسینەکانی ئاوا بن کە لەو ووتارەدا باسی کراوە ، وا دوور بن لە پێوانەی ئەدەبی و زانستی یەوە چۆن لە پێنج کۆنگرەی خۆتاندا زۆرترین دەنگتان دایەو کردتـان بە ســەرۆکی خۆتان و ئێستاش بە ئاواتەوەن بێتەوە ڕیزتان ؟

**جاربەجار حەمدی گلەت گەر لێ بکا ناحـەق نی یە**
**جەردە ڕامەگـرە نەڵێن خـەڵقی کە جـانی جانتـە**

(١) بڕوانه : مەلا مستەفا سەفوەت . شانۆی ناوماڵ . بەغدا . ١٩٧١ پێشەکی . ل ٥ .

(٢) دەربارەی خوێندنی مامۆستا سوجادی لەلای سەفوەت چەند موناقەشەیەکمان لەپاش مەرگی مامۆستا سوجادی بوو . کۆمەڵێ بەڵگەی دەستخەتی مامۆستام لەو بارەیەوە لابوو . پێشکەشی کاکە برایمی میرانیم کرد کە لەسەر مامۆستا سوجادی دەنووسێ .

(٣) سەیر ئەوەیە مونەفیزی ووتار لای نەنگ نییە کە کوڕی کەشاف ( چاوەش )ێکی نەخوێندەواری شارەوانی بنووسێ ( لە خێزانێکی دەرەبەگی گەورەی دێهاتی کوردستان )ەو باسی باوکی وەك ( موسەقەفێکی گەورەی عوسمانی ) بکاو هەندێ یادگار کە لە کتێبخانەی خەڵك دزراون دابنێ بۆ ( متحف الآباء والأجداد )ی خۆیو وێنەیەکی کۆنی باوکی گەورە بکاتو لەژێریا بە خەتی باشترین خەتنووس ناوی حەوت پشتی بنووسێو هەمووشیان ئاغایان پێوە بنێ . ( کە ئەمە کەس لە ماڵی خۆیدا نەیکردووە ) . بەڵام لای نەنگە کەسێکیتر دەیان کتێبی باووباپیری لە بەردەستدا بێو دەستبداتە بڵاوکردنەوەیان . خۆ کە بڵاویشیان نەکاتەوە ، ئەوا هەر لە سەنگەرەکەی مونەفیزی ووتارو هاوەڵەکانییەوە ڕیشدارێکی وەك مونەفیز لەسەر مینبەرەکەی باوکییەوە جنێوی لەسەر ئەو بڵاونەکردنەوەیە پێبدا .

(٤) علاءالدین سجادی . مێژووی ئەدەبی کوردی . چ ٢ . بەغدا ، ١٩٧١ . ل ٦٠٢ .

(٥) عبدالكريم محمد المدرس . علماؤنا في خدمة العلم والدين . بغداد ، ١٩٨٣ . ص ٥٧٢ .

(٦) بڕوانە ژیان ژمارە ٤٥ ساڵی ١٩٢٦ . ژیان . ژمارە ٣١٢ ، ١٩٣٢/٢/٢٥ . ژمارە ٣٢٣ ، ١٩٣٢/٥/٢٦ .

(٧) گولستان . شاکاری سەعدیی شیرازی . مەلا مستەفا سەفوەتی حاجی مەلا ڕەسووڵ کردوویە بە کوردی . بەغدا ، ١٩٦٨ ل ٣ ، ٤ .

(٨) هەرئەوێ ، ل ٤ .

(٩) ( ڕق )و ( تامپۆن ) دوو چیرۆکی هونەرمەندانەی دوکتۆر کاوس قەفتانن لە واقیعی ڕقو کینەی یەکێك لە مامۆستایانی مونەفیزی ووتارەوە بەرامبەر بە هەمووکەسێکی خاوەن ئیبداعو خاوەن بنەماڵەی دیارو خزمەتگوزارەوە پەیدا بوون .

(١٠) ڕەفیق حیلمی . شعرو ادبیاتی کوردی . ب ٢ . بەغدا ، ١٩٥٦ل ٥ ، ٦

(١١) بیری نوێ . ژ ٣٠٥ ساڵی ٧ ، ١٩٧٨/٨/٢٦ . ل ٤

(١٢) عبدالكريم محمد المدرس . علماؤنا في خدمة العلم والدين . بغداد ، ١٩٨٣ . ص ٢٠٩ .

(١٣) وەك بیستوومە ئێستا گۆڤارەکە پاداش ئەدا بە نووسەرەکانی ، لەبەر ئەوە بوڵدی گەورە بۆ قەوارە زلکردن باشە بۆیان . هەرچی ئێمە بووین ئەوا بە هەژاریو بە قەرزوقوڵە گۆڤارەکەمان دەرئەکرد بە سەروماڵەوە . لەبەرئەوە کەرەسەی زۆرمان تێ ئەترنجان .

(١٤) نازانم سجەلەکانی فەیسەڵی یە ئێستا لەکوێن ؟ تا بچێ سەیریان بکات و بڵێ چۆن کەسێك لە نفووسدا لەدایكبووی ( ١٩٣٤ )ە ، لە ( ١٩٣٩ )دا لە قوتابخانە وەرتانگیرتووە . هاوسەنگەرێکی مونەفیز دوکتوراکەی لە مامۆستایەکی ئەو سەندبۆوە ، نازانم ئەمیش شەهادەتنامەی سەرەتایی یەکم لێ ئەسەندێتەوە یا بەڕێوەبەرەکە دەرئەکات ؟

(١٥) ڕەنگە مونەفیزی ووتار کە بەزۆر لە ڕاستیی ژیانی من خۆی لائەداو وائەزانی زوربەی ژیانم لەبەر کتێبخانەیەکی کتێب فرۆشتنی سلیمـانیو چاپخـانەیـەکیا ڕابـواردووە . پێوەندیی منی لەگەڵ ئەمانە لا سەیر بێ . بۆ ناوی تۆفیق زیادیش کـە لە فەلەستینی داگیرکراو ئەژی ، ڕەنگە لای ئەوو هاوەڵەکانی زۆر سەیر بێ کە یادگاری ساڵو نیوێکی پێکەوە ژیانی مۆسکۆم لەگەڵ ئەم شاعرە گەورەیەی بەرگریی فەلەستینی هەیە .

(١٦) مەبەس لەمە تێ گەیاندنی ئەم شاعیرانەیە لە زۆر لایەنی ژیانی کوردو ئەدەبی کوردی .

(١٧) گوران . ڕۆژنامەی ئازادی ڕۆژی ٨/ ١٠/ ١٩٦٠ . ووتارێك بە ئیمزای « دڵسۆز »و بە ناونیشانی « بەرهەمی وێژەییمان ئەبێ چۆن بێ ؟ » .

(١٨) ڕۆحی مەولەوی .ب ١ .سلێمانی ١٩٣٥ .ل ١٠٦ .

(١٩) هەرئەوێ .ل ١ .

(٢٠) بڕوانە : الواقعية في الأدب الكردي . صيدا ـ بيروت ، ١٩٦٦ ص ٧١ . ( تێ بینی : وەرگێڕانە کوردی یەکەم لەو ڕەشنووسەی وەرگێڕانی کتێبەکەوە وەرگرت کە ( نووسەر فوئاد مەجید میسری وەریگیڕاوەو ئامادەی کردووە ) .

(٢١) بڕوانە : « سەرنجێ لە زمانی ئەدەبیی یەکگـرتووی کـوردی » . بەغـدا ، ١٩٧١ . ل ٢٤ ، ٢٥ .

(٢٢) بڕوانە بڵاوکردنەوەی ئەو موحازەرەیە . گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » . ژمارە ١٠٧ . ئەیلوولی ١٩٨٥ .ل ٥٩ ـ ٦٠ .

(٢٣) بڕوانە .دیوانی سەفوەت ,بەغدا ، ١٩٨٤ .ل ٧٤ .پەراوێز .

(٢٤) هەرئەوێ .ل ٩٤ .پەراوێز .

(٢٥ ـ ٣١ )ئەم وتارە بەشێکیشی دەربارەی هێمنی مەهابادی تیابووکە مونەفیزی وتار ناوی لە وتارەکەیدا هێنابوو و کردبووی بە بیانووی کۆمەڵێ هێـرشی‌تر . ئـەو بەسـە ( ٧ ) پەراوێزی لە ( ٢٥ )ەوە تا ( ٣١ ) لەسەربوو . لەکاتی بەچاپ‌گەیاندنی ئەم وتارەدا لەبەر ڕێزی مردوو ـ کە هێمن لەم دواییـەدا کۆچی دوایی کـردووە ـ ئەو بـەشـەم

بەپەراوێزەکانیەوە لادا . بەهیوام ئەم کارە ئامۆژگاری‌یەکی باشی بۆ مونەفیزو پاڵپێوەنەرەکانی پێوەبێ - ع. م. ر.

(٣٢) نووسەر فوئادی مەجیدی میسری لەو پێشەکی‌یە کوردی‌یەدا کە خۆی بۆ وەرگێڕانە کوردی‌یەکەی خۆیی نووسیوە ، لەم‌بارەیەوە ئەڵێ :

« ئەم بەرهەمە کە ئێستا بە زمانی کوردی لە بەردەست خوێنەردایە زوربەی خوێنەرانی ئەم سەردەمە لێی بێ‌ئاگان . لەکاتێکا یەکێکە لەو سەرچاوانەی تا ئەوکاتەی کتێبخانەی کوردی بە باس و لێکۆڵینەوەی زانستیی تێرو تەسەلتر پڕدەبێتەوە هێزو پێزی خۆی دەپارێزێ . بۆ ئەوکەسانەیش کە بە توێژینەوەی ئەدەبیاتی کوردی‌یەوە خەریکن دەلاقەیەکی گەورەی لەناو باسەکانیدا پڕکردوتەوە . بەڕادەیەك حاڵ گەیشتوتە ئەوەی هەندێك نووسەر بە پەرەگراف و لاپەڕە ، بۆچوون و ( استنتاج )ە زانستی‌یەکانی ئەم کتێبەیان وەرگرتووە ، بێ‌ئەوەی دەست بۆ سەرچاوەکەی درێژ بکەن .

یەکێك لەوانە « عومەر مارف بەرزنجەیی‌یە » . ناوبراو لە کتێبی « لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی »دا بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر سوودی لەم سەرچاوەیە وەرگرتووەو بیرو ڕایەکانی دکتۆر عیزەدینی دەقاودەق نووسیوەتەوە بێ‌ئەوەی دەستنیشانی سەرچاوەکەی بکا . نووسەری ئەم چەند دێڕە - واتە فوئاد - لە ووتارێکدا هەندێ لەو ڕاو بۆچوونە زانستی‌یانەی ناو ئەم کتێبەی لەگەڵ کتێبەکەی « عومەر »دا بەراورد کردبوو . بەڵام بەداخەوە لە بڵاوکردنەوەیدا زیاد لە چەند نموونەیەکی کوردی‌و عەرەبی‌یەکەی قرتێنرابوو . ... لێرەدا بە پێویستی نازانم سەرلەنوێ ئەو بەراوردە بکەمەوە . بەتایبەتی چونکە چیروکنووس ( ڕەئووف حەسەن )یش لە ژمارە ( ٧٧ )ی گۆڤاری ( ڕۆشنبیری نوێ )دا ( ١٢ ) پەرەگراف بەنموونە هێنابۆوە . جگە لەوەیش خوێنەری بەڕێز کە ئێستا هەردوو بەرهەمەکەی ( دوکتۆر )و ( عومەر )ی لە بەردەستدایە ، دەتوانێ بە ئاسانی بەراوردیان بکاو حوکمی عادیلانەی خۆی لەسەربدا . ( نووسینەکەی فوئاد تەواو ) .

بەداخەوە تائێستا ئەو وەرگێڕانە نەکەوتۆتە بەردەستی خوێنەران ، ئۆباڵیش هەر لەسەر ئەستۆی خۆمە . هیوادارم ئەوکاتە ئەو بەراوردە بکرێ . لە لایەکی‌ترەوە بێجگە لە ڕەئووف حەسەن کە دوستی نزیکی مونەفیزی ووتارە دوکتۆر حەمشید حەیدەریش لە ژمارە ٣ ی گۆڤاری ( هیوا )دا کە لە پاریس دەرئەچێ ، ئیشارەتی بۆ ئەم دزی‌یە ناڕەوایە کردووەو ووتارێکیشی بە ناوونیشانی ( دزبگرن )ەوە بەڕێوەیە .

دیارە مونەفیزی ووتار هەر بۆ ئەوەی ڕاستی ئەوە بسەلێنێ کە ئەبێ ( دز خاوەن ماڵ بگرێ ) خۆی کردووە بە داردەست بۆ ئەم ووتارەی ئێستای ، باوەڕیشم پێ بکەن من ئاگاداری ئەو بەدزی یەوە گرتنەی نەبووم .

(٣٣) ئەم چەشنە چەورەو دەمڕووتانە مارکس بە خڵتەی چینی کریکاریان دائەنێ . داردەستی چەوسینەرەوەن .

(٣٤) ژیان . ساڵی ١١ . ژمارە ٥٠٥ . ٧ ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٦ .

**کە من ڕۆییم جهەننەم پڕ مەکەن لێم**
**لەمن خاڵی مەکەن کۆشك سەراتان**
**منم سەرکردەتان بۆ لە شکری خەم**
**ئەترسم من بڕۆم بشکێ سوپاتان**

**- کوردی -**

# مامۆستا ڕەقیب و ڕەخنە زانستیانەکەی !

● حیلمی عەلی شەریف ●

لە گۆڤاری ـ نووسەری کورد ـی ژمارە ( ١ )ی خولی سێیەمی ئازاری ساڵی ١٩٨٥دا بەڕێز مامۆستا عبدالرقیب یوسف بەناوی هەڵسەنگاندن ـ ەوە باسی کتێبی ـ مێژوو ـی دوکتۆر کەمال مەزهەر ـی کردووە ، تیایا بەم جۆرەی خوارەوە ناوی نووسەری ئەم سەرنجەو مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمی هێناوە .

« تائێستا دووکەس لەسەر ئەم کتێبەیان نووسیوە . یەکەمیان بەڕێز کاک ( حیلمی عەلی شەریف ) ـە کە لە ڕۆژنامەی هاوکاری ڕۆژی ١٩ / ١ / ١٩٨٤ « ژمارە ٧٢١ »دا کتێبەکەی هەڵسەنگاندووەو نیزیکەی لاپەڕەو نیوێکی ڕۆژنامەکەی پێ گرتووەتەوە . ئەم گۆتارە سەرباری درێژییەکەی هەر پێداهەڵدان و ستایش کردنێکی پەتی و ڕووتەو ، ناچێتە خانەی نرخاندنی زانستانەوە . ئەوە نەبێ کە چەند دێڕێکی لێ تەرخان کردووە بۆ سێ هەڵەی بچووک تێیدا ، ئەوانیش دوانیان زمانەوانین و ئەوەکەی تریشیان لەسەر شوێنی جیوگرافی شاخی ( بیستوون )ە دووەمیان کاک ( محەمەدی مەلا کەریم ) کە سێ بۆچوونی نێو کتێبەکەی لە

روانگەییێکی فەلسەفەیی یەوە لێك داوەتەوەو ، هەڵەییێکی پیوەند بە وەرگێردراوێکی مێژوویی خۆیی راست کردووەتەوە . ( بڕوانە : گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ، ژمارە ( ٦٥ ) ، شوباتی ١٩٨٤ ) .

ئەم دوو برا نووسەرە یا دەبی کتێبەکەیان تەواو بەوردی نەخوێندبێتەوەو بەو کەمو کورتی یانەیان نەزانیبێ کە دوزینەوەی هێندیکیان کارێکی دژواروگران نی یە . یان دەبی لەبەر ریزی برادەریتی حەزیان بەوە نەکردبێ و چاو پۆشی یان لە ناتەواوی یەکانی کردبێ دەنا ئاوها بەسەریاندا رەت نەدەبوو بەشی ( زانستی مێژوو ) بەجێ هێلاوە چونکە یەکێك خەریکیەتی ئەم کتێبە سەرەڕای ئەو زانیاری یە بەجێو تازانەی کە تێیدان لە چەند جێ یەکدا کە لە بەری تێ کەوتووە ، وائێمە بە پێی دەرفەت و توانست بەشێکیان دەست نیشان دەکەین بەو نیازە کە تـوانیبێتمان لەم رووەوە هاوکاری یەکی دڵسوزانـە بکەین . » بەمە دەقی پێشەیەکەی ماموستا رەقیب تەواو بوو .

ئەوی راست بێت لەدوای بلاو بوونەوەی ئەم نرخاندنەی ماموستا رەقیب چەند دوست و برادەرێك وایان بەباش زانی هەر چاو پوشی لێ بکریت و ئەو موڵەتە بە ماموستا رەقیب بدرێت با داخی دڵی خوی بە دوکتور کەمال مەزهەرو ئیمەی نرخێنەری بەرهەمەکەەبرێـژرێت ! بەلام لەبەر ئەوەی ماموستا رەقیب بەفیداکارو تێکوشەرو کوڵنەدەرێکی خوێندەواری کورد ئەزانم هەرگیز ئەو جورە نرخ لێنانەی پێ رەوا نابینم ، بویە بە پێویستم زانی وەلامی بدەمەوەو بەم جورەی خوارەوە سەرنجی بو چەند خاڵێك رابکێشم کە بەڵکو لەمەو لا وردو زانستیانە و دەسەلاتدارانە تر وەکو خوشی هەروای پێ خوشە بێتە کوڕی نرخاندن و رەخنە گرتنەوە .

جاری لەشەش کەس زیاتر نەك وەکو ئەو ئەڵێت دوو کەس کتێبی ـ مێژوو ـیان نرخاندووە ، ئنجا تکام وایە لە بەرێوەرانی بەرێزی گوڤاری

نووسەری کورد دەقی نرخاندنەکەم بۆ بلاّوبکەنەوە تاکو خوێنەرانی کوردو ماموّستا رەقیب خوّشی بزانن ئایا تەنیا سێ هەڵەی پچوك ، دووانیان زمانەوانیو سێیەمیان جوگرافی دەربارەی بیستوون باس کراوە ! یان خاڵە گرنگەکانی کتێبی مێژوو هەمووی !؟

ئەمە جگە لەوەی کە هەندی باسو شی کردنەوە لەو نرخاندنەدا جیگایان نەدەبووەوە بۆیە بەڵێنی باس لێ کردنیانم لە داهاتوودا بەخوێنەرانی بەرێزی کورد کەوا لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێدا یەکێك لەو بەڵێنانەم دەربارەی « جیۆپۆلیتیکسو دەوڵەتو سیاسەتی دەرەوەو چارەنووسی جیهان » بەجێ هانیو چاوەڕوانی هەلو دەرفەتی لەباری تریشم بۆ باسکردنی خاڵەکانی تر .

بەلاّم داخم ناچێ کە ماموّستا رەقیب خودی خۆیو هەموو نووسەرانی شایستەی کورد بەدەست ناتەواوی کەرەسەو دەرفەتو هەلو مەرجی نالەباری نووسینو بلاّوکردنەوەوە ئەنالێنن نەئەبوو ئاوا بەتوندیو وشکیو بە کۆنە قینەوە - شەلوکوێرم ناپاریزم - بهاتایە کۆری نرخاندنەوەو ئەو هەڵسەنگاندنەی بخستایە بەر چاوی خوێنەرانی کورد . بۆیە ئەم دوو خاڵەی ئەخەمە پێش چاوو هیوادارم بۆ لەمەو دووا ئەگەر خۆی لە بابەتی نرخاندنو رەخنە لێ گرتندا سەرنجیان بداتێ :

١ - سەبارەت بەوەی بەڕەنجو کوێرەوەریو تێکوشانێکی شایستەو بێ ووچانو درێژ خایەن خۆی خستۆتە کۆڕی مێژوو نووسینەوەو چەند بەرهەمێکی نایابو بەکەڵکی خستۆتە کتێبخانەی کوردەواریو پێش چاوی خوێنەرانەوە کە کەلێنێکی باشیان لە مێژووی کوردو کوردستاندا پڕ کردۆتەوە ، نەئەبوو بەم شاشیو درشتییەی ئەم هەڵسەنگاندنە ناپێویستە خوێنەرانی لە نووسینو کتێبەکانی خۆی بخستایە گومانەوە !

چونکە مێژوو نووس تا وردو لەسەر خۆبێ ئەوەندە نووسینەکانی جێ

گروو جێ باوەڕو دڵگیرو پەسند تر ئەبێت ، وە بەپێچەوانەی ئەمەیەکێك لەماوەی چەند مانگێکدا گردێك بکات بە تەپۆلکە ئاخۆ ئەبێ لەماوەی دەیان سەدان ساڵدا گردیك بکات بەچی ؟!

٢ ـ سەبارەت بەوەی مامۆستا ڕەقیب فێرکارو پەروەردە کارەو هەزاران قووتابی کوردی پێگەیاندووە ئەبێ لەخەڵکی ئاسایی پتر دڵ فراوان و لێ بوردوو رێ نیشاندەرو لەسەرخۆ بێت . چاوەڕوانی ئەوەی لێ ئەکرێت کە کار هاتە سەر بەراوردکردنی توێکڵ و ناوەڕۆك ، قەوارەو گەوهەر ، توێکڵ بکات بە قوربانی ئەوی تر .

با دوکتۆر کەمال مەزهەریش لە کاتێکی ناکاتداو لە هەلۆیستێکی بێ کێشو تەرازوودا سووکە هەڵەیەکی بەرامبەر مامۆستا ڕەقیب لە دەست ترازابێت ـ کە ئەگەر مامۆستا ڕەقیب مۆڵەتی بدامایە ، بەفری نێوان ئەم دوو مێژوو نووسە بەنرخەی کوردم ئەتوانەوە ـ نەئەبو ئێتر مامۆستا ڕەقیب نەك هەر ـ مێژوو ـی دوکتور کەمال مەزهەری لەبەر چاو بکەوێت بەڵکو شەش حەوت نرخێنەری بەرهەمە بایەخدارەکەی دوکتۆر کەمالی لاببێت بەدووان و ئەو دووانەشی لا ببێت بەستایش خوان !!

بەم بۆنەیەوە بە پێویستی ئەزانم چەند دێڕێکی سەر پێیی دەربارەی نرخاندن و ڕەخنە گرتن بخەمە پێش چاوی خوێنەرانی دڵسۆزی کورد .

ـ کە بەرهەمی نووسەرێك ئەنرخێنین ئەبێ پێش هەموو شتێك سەرنج بدەینە ناوەڕۆکی نووسینەکەوە ناوەڕۆك بکەین بە باڵا دەستی قەوارەو ڕووپۆشی ئەو بەرهەمە .

ڕاستە بەرهەمی نایاب و بەجێو دڵخۆشکەر ئەو بەرهەمەیە توێکڵ و ناوەڕۆکی ، قەوارەو گەوهەری شان بەشانی یەکتری لە سەر پێ ڕابوەستن و لەگەڵ یەکتری‌دا بگونجێن ، ڕاستە ناوەڕۆکی نایاب و گەڵو

وڵات بەرەو پێش بەر ، قەوارەی جوان و رازاوەو نازداری ئەوێت ، بەلام ئەگەر نیازپاك و نووسین روو لە هەورازو ئامانج چارەسەر كردنی كێشەو بەرەو گیرو گرفتەكانی نێو كومەڵگای كوردستان و رۆشن كردنەوەی رەوتی بەرەو ئاسۆی ئاوات و ئامانج بوو ئەوا چاو پۆشی كردن لە هەندێ هەڵەی لابەلاو سەرپێ یی ناچێتە خانەی زانستی فەراموش كردنەوە .

هەموو نووسەرانی كورد ئەوراستی یە ئەزانن كە هیچ نووسەرێكی خامە رەنگینی كورد نی یە ئـەركی سازكـردنی ژیان و گـوزەرانی لە كوڵ داماڵرابێت و سەرو مرر خۆی بـۆ بیركـردنەوەو زانستی كـۆ كردنــەوەو نووسین و بــەرهەم هێنــانی سیاسی یــان كومــەلایەتی یــان ئابــوری یان ویژەیی ... تەرخان كردبێت تا بەوپێ یە بەرهەمەكانی ئاڵتون كێش لە تای تەرازوو بدرێت . خۆ گیرو گرفتی چاپ و چاپەمەنی و بلاوكردنەوەو گەیاندنە بازاری خوێندنەوە تا ئاستی نیوەوەرس بوون نووسەران و دانەرانی كتێب و نامیلكەو بەرهەمەكانی تری مانــدوو كردووە . جــاری وا هەیــە دوو جار هەڵەی چاپەمەنی نووسینەكانم بەدەستی خۆم راست ئەكەمەوە ئنجا جگە لە هەڵەی چاپەمەنی دێرێك ئەچێتە ئەمسەرو دێرێك ئەوسەر !

٢ ـ نــرخانــدن و رەخنە لێگـرتن بابــەتێكــە فێــربــوون و زانست و شارەزاییەكی تایبەتی ئەوێت ، پیشەی نرخاندن گەلێك لە پیشەی نووسین و دانان گرانترە ، وە بە پیا هەڵپژان و بە هیچ كردنی بابەتێكی نرخێنراو رەخنە لێگیراو ناوترێت نرخاندن ، بەڵكو زیاتر واتای شی كردنەوەو دەست نیشان كردنی لاچاكەكانی و چارە سەركردنی لایەنە لاوازەكانی ئەگەیەنێت . ئەبێ گیانی دوستایەتی و برایەتی و پەروەردە كاری لە نرخاندنەكەدا زاڵ و رەنگین بێت نەك رق و كین و تۆڵەسەندن .

٣ ـ وەكو لە پێشەوە باسكراوە نرخانــدن و رەخنەو رەخنــە لێگرتن بابەتە نووسینێكی تایبەتی یەو شارەزایی دەسەلاتی زانستیانەی تایبەتی

ئەویت ، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ نرخێنەرو رەخنە گرێك ئەو دەسەڵاتەی نی‌یە گەریزی خامەی خۆی بگرێت کە ئەبێ هەرواش بێت ، دەست بداتە هەموو بابەتە زانستێك سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و زانیاری‌و هونەری‌و رۆشنبیری ... ئەمە جگە لەوەی نرخاندنی ناوەرۆکی بابەتێك شتێکەو جۆرە زانیاری‌یەکەو لێ دووانی توێکڵو قەوارەو شێوەی بابەتێك شتێکی ترەو جۆرە زانیاری‌یەکی تری پێویستە . بۆیە نابێ ئەرکی شی کردنەوەو لێکۆڵینەوەی هەموو سوچووکە لە بەرێکی بابەتێکی نرخێنراو بخرێتە ئەستۆی تاکە کەسێك .

وا لە خوارەوە دەقی ئەونرخاندنەی لەسەر کتێبی - مێژوو -ی دوکتۆر کەمال مەزهەر نووسراوە بلاو ئەکەینەوە .

# هەڵسەنگاندنێکی « مێژوو »

## نرخاندنی کتێبی « مێژووی »ی

## دوکتور کەمال مەزهەر ئەحمەد

---

ئیستاش جارێکی تر بە بۆنەی دەرچوون‌و بلاوبونەوەی کتێبی - مێژوو - دیسانەوە باسی ئەم میژوو نووسە هەڵکەوتووەی کوردو کوردستان ئەکەم - لە باسکردن‌و لیکۆڵینەوەی میژوو - کەی‌دا - کە ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆئەم لایەنە گرنگە کە بێ‌گومان کەلێنێکی زەق‌و دیار لە مێژووی کوردو کوردستان پڕئەکاتەوە .

مرۆڤی کورد بێ‌باکانە ئەتوانێت دڵ بەم مێژوونووسە خۆش‌کات‌و لە نێو گەلانی دنیادا خۆی پێوە هەڵکێشێت چونکە لە نووسینەکانیا پشتی بە

هەندێ سەرە مەرجی بنچینەیی زانستی‌یانەی ئەوتۆ بەستووە کە بەردی بناخەن بۆ ئەم جۆرە نووسینانە . لەگەڵ ئەوەشدا بە زمانێکی کوردی رەسەن‌و پاراو بە گشتی‌و بە شێوازی کوردی رستە دارشتن نووسینەکانی دێنە بەرچاومان . وە لە نووسین‌و لێکۆڵینەوەدا پەنای بردۆتە بەر سەرچاوەیەکی زۆرو هەمە رەنگەی مێژوونووسانی کوردو کوردستان ناس‌و مێژووپەروەر .

لە هەمووی گرنگ‌تریش مێژوو بەزانست ئەزانێت بۆیە پشت بە زانستی دیالەکتیکی‌و ئایدیولوژی‌یەتی عیلمی ئەکەوێتە لێکدانەوەو تاووتوێ کردنی نووسینەکانی میژوونووسانی کوردو کوردستان‌و بێگانەو بەو جۆرەش هی خۆی .

بۆیە بە پێویستم زانی کە کورتە باسێك لەسەر کتێبی میژوو بنووسم کە نەك هەر بە شاکارێکی نووسینی خۆی ئەزانم بەڵکو هی ئەوچەرخەی گەلەکەشمان . وە بە ئاواتی هەموو خوێنەریکی کورد - یشی ئەزانم کە لەمەولاش کتێبخانەکانی کوردستان بەم جۆرە کتێب‌و نووسینانە لە لایەن هەموو میژوونووسە زاناو زانست پەروەرەکانی کوردو کوردناسەوە بڕازێرێتەوە . ئەوی راست بێت بۆ نرخاندنی کتێبی - مێژوو - ئەبێ بە قەوارەی خۆی لەسەری بنووسرێت بەلام لێرەدا بۆ ئەوەی دەست‌دانە بەردی سەنگین نەبێتە هۆی هەڵنەگرتنی وەکو پێشینیان ئەڵێن ئەم سەرنجانەم ئەخەمە پیش چاوی خوێنەرانی بەڕێز .

سەبارەت بەوەی کە خۆی لەم کۆرەدا سوارچاکێکی شایستەو زانایەکی لێهاتووە ، گرێ‌و کەموکوری خۆ بە کەم زانینی بە هیچ جۆرێك لە دڵدا نەماوە ، بۆیە هەمیشە هانی مێژوونووسەکان ئەدات بێنە کۆڕی نووسین‌و گەشەکردنی هەولو تەقەللا وە خۆ دورخستنەوە لە گۆشەگیری‌و کوچەگرتن . نەك هەر روو لەوانەش بکات کە ناسیاوو هاوڕێ‌و دۆستین

بەڵکو ئەوانەش کە بە ناهەق لەسەریان نووسیوەو لە نووسینەکانیاو تەقەلادانی بۆ گەیشتن بە پایەی هەندێ کۆری نرخاندنو تاووتوێ کردنی پروفیسۆری بزماری زەهراوی‌یان بۆ داکوتاوە ! بە پێچەوانەی کەسانێك کە بۆیان بڵاوئەکردەوە کە گوایا دکتور کەمال مەزهەر تەنانەت بەوەش زویر ئەبێت پێ‌ی بڵێیت هەڵەی چاپ کەوتۆتە نووسینەکانتەوە .

ئەم ئارەزووە بێ‌گرێییەو لەخۆ بوردنەی گەیاندوویەتی‌یە ئەو رادەیەی کە لە نرخاندنی کتێبو نووسینی مێژوونووسە کوردەکانا دەربارەی مێژووی کوردو کوردستان لایەنە چاکەکەکانیان چاکتر بنرخێنێتو کەموکوری‌و هەڵەو ناتەواوی‌یەکانیان بە چاوپۆشینو کتێبەی‌دا بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئامانجەکەی کە پایەدانە بە مێژوو وە بەستنەوەی هەموو مێژووی دنیایە بە یەکتری‌یەوە باسی مێژووی کردووە لەگەڵ مێژووی هەموو گەلانی دنیاو مێژووی کوردو کوردستان . زۆر باش لەو راستی‌یە گەیشتووە کە تێگەیشتنی مێژووی هەر نەتەوەیەك بە وردی‌و راستی ، شارەزایی ئەوێت لە مێژووی نەتەوە دراوسێکانو مێژووی هەموو گەلانی دنیا ، بۆ ئەوەی مێژووی دوارۆژی هەرنەتەوەیەك رۆشنو رێبازیکی راستو رێ‌رەویکی رەوانی هەبێت پێویستە بێ‌ترسو دوو دڵی کەڵكوەربگیرێت لە لایەنە راستو بایەخدارەکانی مێژووی نەتەوەکانی تری دنیاو پەندیش وەربگیرێت لە لایەنە هەڵەو نالەبارەکانی .

دکتور کەمال مەزهەر رەنگە بە نیازی گلەیی‌کردن لە لایەنێکی تاریکی مێژووی نەتەوەی کورد چیرۆکی ئەفسانەیی هەڵبەستراوی ناو رۆژنامەی پیشکەوتنی ( ٧ )ی ئوکتۆبەری ساڵی ١٩٢٠ی بە نمونە هانیبێتەوە کە لە شاری سلەیمانی دەرچووەو تیایا ئەڵێت « کە دەنگو بانگی پێغەمبەریتی موحەممەدە لموستەفا رووحم بەصەدەقەی پێ گەیشت بە هەموولایەكو

غەلغەلەی خستە دونیاوە وای لیٚهات کەلەو وەقتەدا گەورە ترین سەلاطینی تورکستان حەلقەی بەندەیەتی ئەو سەروەرە بخەنەگویٚ . ئوغوزخان کە لەو وەختەدا گەورەترینی سەلاطینی تورکستان بوو لە پیاو ماقولاٚنی کورد بەغدوز ناوی سەرو سەکوت ناشیرینی ناردە خزمەت پیٚغەمبەر . پیٚغەمبەر کە چاوی پیٚکەوت لەسەرو گویٚلاکی قیٚزی کردەوە . عەشایـرو قەبـایلی لیٚپرسی وتی لە ئەکرادم . ئەو حەزرەتەش فەرمووی خـوای تەبـارەکەن تەعالا ئەم تایفەیە موەفەق بە ئیتفاق نەکات ئەگینا عالەمیٚك لە دەست ئەوان بەتەنگدیٚن . ئیتر لەو رۆژەوە دەولەٚت و سەڵتەنەتی گەورە بۆ ئەمانە ریٚك نەکەوتووە . » .

ئنجا دکتور کەمال لە لاپەڕەی ١٥٢ ی کتیٚبەکەیدا دوا بە دوای ئەم نووسینەی رۆژنامەی پیٚش کەوتن ئەنووسیٚت .

**« بیٚگومان سەرتاپای ئەم قسـانە هـەڵەن ، لیٚرەدا ئـەوەندە بەسە بلیٚین ئایینی ئیسلام ساڵی ١٨ ی کوچی ٦٣٩ عیسایی واتە دوای وەفاتی پیٚغەمبەر لە روزگاری فەرمانرەوایی عومەردا گەیشتە خاکی کـوردستان وە دوای ئـەوەش بە مـاوەیەکی زۆر ئنجـا گـەیشتـە تورکستان » .**

ئەم بەربەرچ دانەوەیە ی دوکتور کەمال ئەمەشی ئەویٚت کە بلیٚین بەغدوز نـاو ئەگـەر لەوەش ئیٚسك گـرانو دەعەجـانی تریش بـوبیٚت کە رۆژنامەی پیٚشکەوتن باسی کردوە نویٚنەری سوڵتانیٚکی تورکستانی بووە نەك هی پاشا یان میریٚکی کوردو کوردستـان جگە لەمـەش پیٚغمبەرانو پیـاو چاکانی خدا کاریان بەسەر شاجوانی‌یەوە نـەبووە بـەڵکو بـەپیٚی خوو رەوشتو کردەوەی جوانو جوامیٚریو خواناسی لەگەڵ خەڵکیدا رەفتاریان کردەووە « إن أكرمكم عند الله أتقاكم » جگە لەوەی کە بەئاگری تاکە کە-
-سیٚك هەرگیز گەلیٚکیان نەخستوتە خانەی خراپانو بەدکارانەوە .

ئەوی راست بێت ئەبێ ئەم ئەفسانەیەی روژنامەی پێشکەوتن بەپێی ئەقڵو هوشیاری نووسەرەکەی هەر بۆئەوە نووسرابێت کە گلەیی لە کوردو مێژووی کورد بکات کە دوو بەرەکیو ناتەبایی لەناویانا پەنگی خواردۆتەوە ، وە بەم تیروتوانجە جەرگ برە کورد هان بدات چارەسەرێکی ئەم دەردە کوشندەیە بکات .

وە لە لایەکی تریشەوە ئۆباڵەکەی لە سەر گەلی کورد لابردووەو فرێی داوەتە سەر ئەستۆی بەغدوزی ئێسك گران !

بێگومان نووسەری ئەم ئەفسانەیە نەیتوانیوە دەستبخاتە سەر هۆیە زانستیو ماددییەکانی ئەم لایەنە تاریکەی میژووی کورد کە لە لێبوردنەوە بخاتە پێش چاو وە هەقو نازناوی مامۆستا بە هەموویان خەڵات بکات .

ئنجا هەر لەسەر ئەم رێبازە هەوڵی داوە مێژوو لای خوێنەران خۆشەویستتر بکاتو بیکات بە بەردی بناغەی زانستییەکان تاکو زیاتر لە گەڵیا خەریك بنو لەسەری بنووسنو هانی نووسەرانی بدەنو تێرو پڕ مێژووی گەلو وڵاتی خۆیان بزانن بێگومان بەم کارە هوشیاری نەتەوایەتی بەرەوپێش ئەباتو ئەمیش پاڵ بەبزوتنەوەی نەتەوایەتیو کۆمەلایەتیو زانیارییەوە ئەنێت کە بە هەنگاوی گەورە بەرەو ئامانجەکانی خۆی بڕوات بەرێوە .

هەروەکو هیگڵ زانای بەناوبانگی دیالەکتیك خوازی ئەڵەمانیا ناکۆکی ناو کۆمەڵ بە هێزی بزوێنەری بەرەوپێشچوونی مێژوو ئەزانێت هەروەها مێژووش بەلای ئەمو هەموو زانایانی هەڵکەوتوو لێهاتووی زانست خوازەوە ڕەنگدانەوەی ئەم هێزە بزوێنەرەیە .

رەنگە گەلێ کەس هەبن تەنانەت لەناو رۆشنبیرانیشا مێژوو بەباسو نووسینێکی سەرپێیی لەقەڵەم بدەن وە بایەخێکی شایستە نەدەن بە

مێژووی نەتەوەکەیان چ جای هی سەرجەمی دنیا یان پێوەندی ئەم مێژووە بەسەرکەوتنی خەباتی ئیستاو دوا رۆژی گەل و وڵاتەوە . بەلام بەتەواوەتی بە پێچەوانەی ئەم لێکدانەوەو بۆچوونە ، هیچ رامیارو پارتی و کاربەدەست و بریار دەری ـ صانع القرار ـ دەوڵەتێك ناتوانێت نەخشەیەکی رامیارانەو راست و دروست و رێبازیکی سەرکەوتووانە بگرێتەبەر ئەگەر بە وردی لە مێژووی گەل و وڵاتەکەی نەکۆڵێتەوەو عیبرەت و پەندی لێوەرنەگرێت و لایەنە راستەکانی نەکات بەسەرچاوەی ئیشوکارو لایەنە خراپ و هەڵەکانی نەخاتە لاوە .

هەموو نەتەوەیەك بەپێی تەمەنی خۆی و بە درێژایی زەمانەو لە ئەنجامی ئەو بەسەر هاتە مێژووییانەی هاتونەتە رێگای ، کەلەپورێکی تایبەتی و داب و نەریتێکی جیاواز لە هی نەتەوەکانی تری بۆ ئەبێت بەبەشێکی گرنگ لە رەوشت و خاسیەتە تایبەتی یەکانی ، کە بەمەو بە مەرجەکانی تر وەکو زمان و زەوی و پلەی ئابوری ..لە نەتەوەکانی تری دنیا جیا ئەکرێتەوەو قاڵب و قەوارەیەك ئەکێشریت بە دەوریا ، وە ئەم داب و نەریت و خاسیەتانەش پێوەندی یەکی زۆرو گرنگ و لە جیابونەوە نەهاتوویان هەیە لەگەڵ شێوازو جۆری خەبات و رێبازی هاندانی بزوتنەوەی نەتەوەیی لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجە ئاسایی و رەواکانیا .

بۆ نمونەو رون کردنەوەی ئەم لایەنەی باسەکە هەمومان ئەزانین کە نەتەوەیەك بە ئازایەتی ناوبانگ دەرئەکات و یەکێکی تر بە هونەرە جوانەکان یان بەخواردەو پەخشندەیی ونەتەوە هەیە پێی ئەڵێن ساردو هێمن و لەسەرخۆیەو هی تر دڕوشە ڕەنگێز .

جا ئەگەر کەسێك بە خەبات و تەقەللای نەتەوەکەیەوە خەریك بێت و بیر لە دوارۆژێکی ئاسودەو روناکی ئەو نەتەوەیە بکاتەوە ، چۆن ئەتوانێت بێ شارەزابوون لە مێژووی نەتەوەکەی خۆی نەخشەی خەباتی

ئیستای نەتەوەکەی‌و شێوە سیستەمی دواڕۆژی بکێشێت ئەگەر لە ئاستی مێژوودا تەقەی سەری بێت ؟!

وە وەکو هیگڵ ـ ی فەیلەسوف وتەنی مێژوو لە ناکۆکی‌یەوە پەیدا بوو‌بێت‌و پێش‌کەوتنی ئابوری‌و پیوەندی‌یەکانی بەرهەم هێنان‌و دوو بەرەکی نێوان چینەزوردارو زۆرلێ‌کراوەکانیش بەری ئەم ناکۆکی‌یە بێ ، ئەبێ هەموو رامیارێکی ناو کۆمەڵ شارەزاییەکی تەواوی هەبێت دەربارەی رەوشت‌و خاسی‌یەتی دروستکەرو دروست‌کراوی ناکۆکی‌و مێژوو .

لەم کلاورۆژنەیەوە هوشیاری‌و زانایەتی خاوەنی کتێبی مێژووە وە یەرهەمەکەی وەکو بەرهەمێکی نایاب‌و بەنرخ دێنەپێش‌چاو . ئنجا لەم ئەنجامی هەڵکەوتی جیۆپۆلیتیکی ( السیاسة الجغرافیة ) ستراتیژی‌یانەی خاکی کوردستان‌و دراوسێتی لەگەڵ خاکی ژمارەیەك ئیمپراتۆری‌یەتی گەورەی ئەوسای دنیا وەکو فارس‌و عوسمانی‌و رومان‌و ئنجا دوای ئەوان سێ ئیمپراتۆریەتی گەورەی تر هی قەیسەری روسی وبەریتانیای گەورەو فەرەنسا کە هەموویان لە پێناوی داگیرکردن‌و ژێر دەستەکردنی ئەم وڵاتەو گەلەکەیدا هەموو هەوڵ‌و تەقەللایەکیان داوەو زۆر زیرەکانە پیلان‌و نەخشەکانی خۆیان هەڵسوراندووە تا سەردارو میرەکانی کورد لە داوی خۆیانیان بئاڵێنن یان بیان‌کەن بە دەستکەلای خۆیان‌و یان ...ان‌خەن بە گژ یەکتری‌دا . لە لایەکی ...یشەوە لاوازی میرو میرنشینەکان ناچاری کردوون هەندێکیان لە ترسی ...ەم داگیرکەر ، یان ئەو داگیرکەر ، یان ترسی یەکتری پەنا بەرنە بەر د... تێکی گەورەی نزیك .

خۆ دەرەبەگایەتی چارە رەش‌و عەشیرەت‌گەری کوێرانەنەش کارێکی بنچینەیی تەواوی کردۆتە ئەم ب... ، مێژووی کوردستان کە هەر دوو سیستەمەکە ناکۆکی‌و دوو بەرەکی‌ی پارچە پارچە بون‌و ناتەبایی نەتەوەن .

هیچ گومانیشی تێدانی یە کە ساغ بوونەوەی زوربەی هەرە زۆری خەڵکی کوردستان بە لای ئایینی ئیسلامداو بلاوبونەوەی مەزهەبی سونەو شیعە لەم پارچەو لەو پارچەی کوردستاندا وەکەڵك وەرگرتنی لە جیاوازی ئەم دوو مەزهەبە بەلای خراپا بەشی خۆی بەناهەق بەکارهێنراون ، بۆ بەش بەش کردن و بلاوکردنەوەی ناتەبایی لەناو سەرجەمی خەڵکی کوردستانا ئەمە جگە لەوەی لە دوای ئیمپراتۆری یەتی میدیای باپیرە گەورەی کوردەوە تا پێش شەڕی یەکەمی جیهان بزوتنەوەیەکی جەماوەرانەو سەردارانی هوشیارو نەتەخواز نەهاتونەتە کوڕێ مێژووی کوردەوە کە یەکێتی نەتەوایەتی بکەن بەرێبازی تێکوشانی خۆیان تا کورد لە دوو بەرەکی و ناتەبایی رزگارکەن . ئەوی راست بێت ئەم باسەی نەتەوەی کورد زۆر دورو درێژو پڕ لە خەمو خەفەتە با جارێ ئەوەندەی بەس بێت .

هەروەکو لە پێشەوە باسم کرد دکتور کەمال مەزهەر ئەوەندە عاشقی مێژووە نەك تەنیا مێژووی کورد بەڵکو مێژووی هەموو گەلان ، عەشقێك کە خستویەتی یە سەر شەقامێك کە هەندێ لایەنی خودی مێژووی بە جارێ پچوك کردوتەوە هەروەکو لە بنەڕەتا نەبێت . لە لاپەڕەی ١٣دا ئەڵێت « یەکێك لە تایبەتێ گرنگەکانی زانست ئەوەیە کە وەستانی بۆ نی یە، هەمیشە بەرەو پێش دەڕوات کیمیافیزیای سەد ساڵ لەمەوبەر بە زەحمەت دەگاتە قولەپیێ کیمیاو فیزیای ئیمرۆکە ، ئەمیشیان دەبێت بە دوربین بروانێتە کیمیاو فیزیای پاش سەد ساڵی تر ، ئەم یاسایە مێژووش دەگرێتەوە .

ڕەوڕەوەی مێژوو هەمیشە بەرەوپێش دەڕوات ، لەوانەیە بۆماوەیەك بوەستێت ، بەلام هەرگیز بەرەو پاش ناگەڕێتەوە هەموو زەبرو زۆری هۆلاکۆ نەیتوانی کاری مزگەری و زەرەنگەری و ئاسنگەری یا پلەی خوێندەواری و روناکبیری عیراقی یەکان بگێڕێتەوە سەر دۆخی ڕۆژگاری

سومەرو ئەکەد . ئەسکەندەری گەورەو شارلەمانو رەشید وەك هەموو گەورە پیاوانی رابوردوو گەر ئیمڕۆ زیندو ببنەوە دەبێت لەگەڵ کۆپەرنیکۆسو گالیلۆو ئەدیسونو هەموو زانایانی رابوردوودا پێکرا روو بکەنە یەکێك لە شێتخانەکانی ئەم جیهانە پانو بەرینە . » .

ئەم لێکدانەوەو بۆچوونەی دکتور کەمال بۆ هاندانو ورە بەرزکردنەوەی کوردو گەلانی تر کارێکی ئیجگار بە کەڵکە ئەگەر لە خۆ نیشاندا و کۆبونەوەیەکی جەماوەری خەڵکدا قوتابییەك بیوتایە . بەڵام بۆ دکتور کەمالو لەکتێبێکی زانستییانەی بایەخداری وا دا لام وایە باسکردنێکی ئەوێت . راستە کیمیاو فیزیا هەربەرەو پێشئەڕۆن ، وەئەو ئاستەی پێی دەگەن ئیتر لێی نایە خوارەوە ، پسپۆڕەکانی دەرمان ـ سازی ئیتر جارێکی تر دروستکردنی پەنسلین ـ یان لە بیرناچێتەوە هەروەکو فڕۆکەی تیژرەوو تەلەفیزیونو بۆیە دروستکردن لە وڵاتێکی وەکو سویدو فەرەنساو سۆڤییەتدا جارێکیتر نابنەوە بە گالیسکەو گرامەفۆنو رەنگی خومخانەی توێکڵە هەناروو مازوو ، بەڵام ڕەوڕەوەی مێژوو رەورەوەی دارو ئاسنو لاستیك نییە ، بەڵکو مەبەست لە دەسەڵاتداریتی نەتەوایەتیو چینایەتیو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو پێوەندییەکانی بەرهەمهینانو ئازادی گەلو نەهێشتنیان بەرە بەرە کەم کردنەوەی چەوساندنەوەی بەشە زۆرەکەی گەلە کەجەماوەری زەحمەتکێشە . یان مەبەست پاراستنی سەربەخۆییو دەسەلاتدارێتی گەلو وڵاتێکە لە پەلاماردانی دوژمنێکی دەرەوە کە بەهێزێکی گەورەتر لە هێزی ئەو وڵاتە لە دەسەڵاتی سیاسیو ئابوری خۆی بێبەش بکات ، یان مەبەست پاراستنی قەوارەی نەتەوەو رەوشتو خاسییەتەکانێتی لە تواندنەوەو تێکەڵبوون بە نەتەوەیەکی گەورەو دەسەڵاتدارتر .

ئەگەردوکتور ئەم نیازو مەبەستە بسەلمێنیت سەدان نمونە هەیە کە

پێمان ئەگەیەنێت کە گەلێك جار ڕەورەوەی مێـژووی نەتـەوەیەك بـەرەو پـاشەوە چـووە یان بـەرەودواوە براوە ، سـا گونـاه لە نەتـەوەکـەو سەردارەکانی یەوە بو بێت یان لە زۆردان و داگیرکەران و دەسەلاتدارانی بێگانە هـەردوو لایانـەوە بوبێت . هـەروەکو خـۆشی ئەی سـەلمێنیت کە ڕەورەوەی مێژوو ڕەنگە ڕاوەستانی هەبێت ، بەلام ئەم ڕاوەستانە خۆی لە خـۆی لە خۆیـا بەرەو دواوە چـوونە . چـونکە هـەر سـات و کـاتێـك لە کیس چوون ، وە لە کیس چوونی هەر پێشکەوتن و سەرکەوتنێکی چاوەڕوان کراو یان دەستکەوتوو بە دواکەوتن ئەژمێردرێت .

ئەگەر دوو خوێندکار بەیەکەوە پێ بنێنە پۆلی یەکەمی زانکۆیەکەوەو یەکێکیان هەموو سالێك بێ گیروگرفت بە پایەیەکی باش پۆلی خۆی بەرەو یەکێکی ژوورتر ببڕێت . وە لە کات و ماوەی خۆیدا زانکۆ تەواو بکات و ئەوی تریشیان بە شپرزەیی سالێك بە دوو سال تەواو بکات ئایا خـوێندکـاری دووەمیان بە دواکەوتوو ناژمێردرێت ؟

چاوخشانێك بە مێژووی دروست بوونی نەتەوەی ئیتالیادا وەهی ئەو چەند سالەی دوایی ئەمەریکاو دروست بونی نەتەوەی فەرەنسا ئەوەمان بۆ ڕون ئەکاتەوە کە گەلێك کەمایـەتی نەتـەوایەتی یـان لە هەنـدێ جێگای ئەفەریقا نەتەوەی خاوەن خاسی یەتی نەتەوایەتی تەواو تواونەتـەوە ، نە دەنگیـان ماوەو نـەڕەنگ و هـەندێکشیـان وەکو لە قـوولایی بیرێکـدابن نوزەیەکیان دێت و نایەت ! مێژووی سیاسی ڕژێمە جۆراوجۆرەکانی دنیا پڕە لە نمونەی زەق و دیاری ئەم باسە .

لە ناوچوونی شۆڕشی گەلی ئیسپانیای ۱۹۳۷ لە پێنـاوی ڕژێمێکی جمهوری دیموکراسی وە سەرکەوتنی فرانکۆی دیکتاتورو سەر بـە ڕژێمە فـاشستی یـەکـانی ئـەلەمـانیـاو ئیتـالیـاوە دامـەزرانـدنی ڕژێمێکی کۆنەپەرستانەی گۆشەگیرو ئاڤەرۆزکراو لەسەر ئیسکوبوسکی هـەزاران

شەهیدی ئازادیخوازی ئیسپانیایی تا مردنی فرانکۆو هێنانەوەی شاخوان کارلوس بۆ سەرتەخت بەڵگەی راستی ئەم بەرەودواوە چوونەیە .

درێژەکێشانی رژێمێکی دیکتاتوری نزیکەی نیوە سەدەیەك وە رێگەگرتن لە دامەزراندنی رژێمێکی دیموکراتی شۆڕشگێرانە وە بێبەشکردنی گەلێك لە مافی ئازادیو سەربەستیو دیموکراتیو گوزەرانێکی ئاسودە ئەم ماوە دوروو درێژە نەبێت بە رەورەوە وەرچەرخان بەرەودواوە ، ئاخۆ رەورەوە وەرچەرخان بەرەودواوە ئەبێ چۆن بێت ؟!

هەرچەندە ئەو دڵخۆشیدانەوەی دکتور کەمال خۆشو هیوا دروستکەرە لە دڵی خوێنەرانی مێژوودا و بڕوا پەیداکردنە بە خەباتی کاریگەری گەلان بەڵام لە هەمان کاتدا کەمتەرخەمیو بێباکی لە دڵی تێکۆشەرانی گەلاندا دروست ئەکات کە ئەمەش رێگا ئاواڵە ئەکات دوژمنان بە ئەرکو تەقەللایەکی کەم چرنوکی ژەهراوییان لە دڵی نەتەوەو کۆمەڵانی خەلکیاگیر بکەن . هەروەها دووانی دەربارەی سەرکردەش سەرنج رائەکێشێت . لە دامێنی لاپەڕەی چواردەوە تا لاپەڕەی هەڤدە باسی گەلو سەرکردە لە مێژوودا ئەکاتو ئەڵێت :

**« رەورەوەی مێژوو یەکجار گەورەو زەلامە ، بەرەو پێش بردنی هەرگیز لە وێزەی تاکە کەسێکدا نەبووەو نییە ، بێگومان خاوەنی میژوو گەلە . بە چاكو بەخراپ ئەرکی گەورەی هەموو بەسەرهاتو رووداوێك دەکەوێتە ئەستۆی کۆمەڵانی خەڵك ... »**

ئیتر ئەم باسە بەشێوەیەکی رازاوەو جوانو پشت بە چەند نمونەیەکی زیندوو دیار وەکو هی شۆڕشی بیستی عیراقو چالاکی سیاسی ناپلیۆنو محەمەد عەلی گەورەی میسرو سپارتاکوسی قارەمانو سەرکردەی شۆڕشی کوێلە رۆمانییەکانی دو هەزارو پەنجا ساڵ لەمەوپێش ئەهێنێتەوە کە پێمان بسەلمێنێت گەلبنچینەی دروستکەری مێژووەو سەرکردە بەتاقی

